طلب العلم

فريضة على كل مسلم

# ئایا بە دوای کارێکدا دەگەڕێیت؟



نوسینی : د. محمد العریفي

وەرگێڕانی : م. مجید حمید مجید / کفری

پێداچوونەوەی : صلاح الدین عبدالکریم

چاپی یەکـــەم

٢٠٠٨زاینی

١٤٢٩کۆچی

# ئایا بە دوای کارێکدا دەگەڕێیت ؟

**نوسینی:** د. محمد العريفي

**وەرگێڕانی:-** باوكي يوسف
م.مجيد حميد مجيد/كفري

**پێداچونەوەی:** صلاح الدين عبدالكريم

**چاپی یەکەم**

**١٤٢٩ك/ ٢٠٠٨ز**

**ناوی کتێب: ئایا بەدوای کارێکدا دەگەڕێیت؟**

**ناوی نووسەر:** د. محمد العريفي

**ناوی وەرگێڕ:** باوكي يوسف م/ مجيد حميد مجيد (٠٧٧٠١٩٩٢٣٩٢).

**پێداچونەوەی:** صلاح الدين عبد الكريم .

**ژمارەی سپاردن:** ژمارە (١٤١٠) پێ دراوە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حكومەتی هەرێمی كوردستانەوە .

**نۆرە و ساڵی چاپ:** یەكەم ـ (١٤٢٩ هـ / ٢٠٠٨) .

**بنكەی بڵاوكردنەوە :** كتێبخانەی سیما / چەمچەماڵ (٠٧٧٠١٢٢٦٠٨٩) .

**چاپخانە :** سیما / سلێمانی .

**دیزاینی بەرگ:** كۆمپیوتەری جیهان/ چەمچەماڵ.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ باللهِ من شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَات أَعْمَالنَا مَنْ يَهْده اللهُ فَلا مُضلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَاديَ لَهُ .

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ [سورة آل عمران ١٠٢] .

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ [سورة النساء : ١] .

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ [سورة الأحزاب : ٧٠ ــ ٧١] .

أَمَّا بَعْدُ ...

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْث كتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِه وَسَلَّمَ) وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُها وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری میهرەبان و درووود و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ ... لەپاشاندا ...

بەڵێ .. زۆربەی خەڵکی سوورن لەسەر کارکردن .. وەپێشبڕکێی بۆ دەکەن.. هەر کاتێك لە جێگایەك بانگەواز بکەن بۆ ئەوەی کە کرێکاریان دەوێ یان فەرمانبەریان دەوێ .. ئەوا دەبینین بە هەزاران کەس پێشبڕکێی بۆ دەکەن .. بەڵام دەزانی شوێنکارێکی بەتاڵ هەیە .. کارێکی خودایییە .. خوای گەورە بۆ هەموو جیهانی خستووەتە ڕوو .. وە کەس ناتوانیت ئەو کارە بە دەس بهێنێ تەنها کەسانێك نەبێت کە خوا خۆشیانی دەوێت .. پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت :- (إذا أراد الله بعبد خيرا استعمله، قالوا يا رسول الله ﷺ وكيف يستعمله؟ قال؟ يوفقه لعمل صالح قبل موته)[1].

واتە: ئەگەر خوای گەورە چاکەی بۆ بەندەیەکی ویست ئەوا پێش مردنی کارێکی پێ دەسپێرێ.. کابرایەك پرسی:- چ کارێکی پێ دەسپێرێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :- خوای گەورە یارمەتی و ئاسانکاری بۆ دەکات بۆ کاری چاکە و بەو شێوەیە گیانی دەکێشێ . بۆیە پیاو چاکان غەمبار دەبوون کاتێك لە دەستیان دەرچووبایە .. تەماشاکە خۆشەویستمان ﷺ باسی ڕۆژی قیامەت بۆ هاوەڵانی ﷺ دەکات وە هەواڵیان دەداتێ کەوا حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتەکەی دەچنە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە و سزادان .. هاوەڵان ﷺ سەرسام دەبن بۆ ئەو ڕێزە گەورەیە .. بە بێ دواکەتن و بە پەلە

(١) (ظلال الجنة: رقم: ٣٩٧) .

(عکاشەی کوڕی محصنﷺ) خۆی دەهاوێژێتە ناو ئەو مەسەلەیەوە و ئەو هەلە لە دەستی خۆی نادات و پێش ئەوەی لە دەستی دەربچێت بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت:- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوا لە خوا بکە کە من ببمە یەکێك لەوان .. خۆشەویستﷺ فەرمووی:- تۆ یەکێکی لەوان .. وە عکاشەﷺ ئەو پلەیە دەباتەوە.. ئەمجار دەرگاکە دادەخرێت .. وە بە یەکێکی تر لە پاش ئەو دەڵێت ﷺ:- عکاشەﷺ پێشت کەوت .. بەڵێ ئەوان لە پێشبڕکێدا دەژیان لە هەموو دەرگایەك لە دەرگاکانی چاکە .. کەچی تۆ خۆت دەبینی کە هەرگیز لە گۆڕەپانی کرداری چاکەدا پێشبڕکێ ناکەیت لەگەڵ پیاو چاکاندا .. بۆیە لێپێچینەوە لەگەڵ خۆتدا بکە .. رەنگە تاوانەکانت هۆیەك بن .. وە ئەو کەسانە بهێنە یادی خۆت .. کە خوای گەورە خۆشیانی ناوێت و لە چاکەدا کاریان پێ راناسپێرێ.. خوای گەورە دەربارەی دوو ڕووەکان دەفەرموێت:-

﴿وَلَوْ أَرَادُواْ الْخُرُوجَ لأَعَدُّواْ لَهُ عُدَّةً وَلَـكِن كَرِهَ اللّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ اقْعُدُواْ مَعَ الْقَاعِدِينَ﴾ [التوبة: ٤٦] ٠

واتە:- ئەگەر ئەو دووڕووانە بیانویستایە دەرچن (بۆ غەزا) ئەوە خۆیان بۆ ئامادە دەکرد، بەڵام خوا چالاکی نواندن و دەرچوونی ئەوانی نەویست (چونکە دڵ و دەروون نەخۆش بوون)، لەبەر ئەوە سستی کردن و لەشی قورس کردن پێیان وترا: دانیشن بۆ خۆتان لەگەڵ پیر و منداڵ و پەککەوتەکاندا ٠

بۆیە من لێرەدا هەوڵم داوە و کۆمەڵە کارێکم خستووەتە روو کە پاداشتێکی گەورەیان هەیە .. وە لەم چەند لاپەڕەیەدا بڵاوم کردووەتەوە وە هەرچی شتێکی تیادا راست بوو ئەوا لەیارمەتی و ئاسانکاری و چاکە و رێزی خوداوەیە، وە هەر هەڵەیەکی تیادا بوو ئەوە لە من و لە شەیتانەوەیە وە من تەوبە لەو هەڵانە دەکەم

و داوای لێخۆشبوونی لـێ دەکـەم .. وە چـاوەڕوانی ئاگادارکردنـەوە و ئامۆژگـاری ئێوەم و سوپاسی ئەو کەسە دەکەم کە ڕێنمویی و ئامۆژگاریم دەکات و دوعـای بـۆ دەکەم

داوا لە خوا دەکەم کە موسڵمانان سوودی لێ وەربگرن ...آمین........

نوسيني // محمد بن عبدالرحمن العريفي

**************

... لە ئێوارە شەوێکی زستاندا زەنگی تەلەفونەکە لێیدا .. کە هەڵمگرد زانیم (عبداللە) یە .. بەڵێ .. عبداللە ساڵی پێشوو کۆلێژی تەواو کرد و لەو کاتەوە چیتر پەیوەندیمان نەماوە .. هەر کە دەنگی ئەوم بیست .. یەکسەر وێنەی هاتەوە یادم کە هەردەم روویەکی گەشاوەی هەبوو، گەنجێکی بە شان و شەوکەت بوو .. سڵاوی خوات لێ بێت ئەی عبداللە .. چۆنیْ .. دەنگ و باست چۆنە .. ئەی .. لەم کاتەدا بە دەنگێکی لاوازەوە قسەکانی منی بڕی:– ئەی مامۆستا ئێستا کەوتمە یادت؟ گوتم:– بەڵێ .. چۆن لە بیرت دەکەم .. زۆر لەگەڵ قسەکانی مندا تێکەڵ نەبوو وە هیچ وەڵامێکی ئەوتۆی نەبوو .. بەڵام بە دەنگێکی لاوازەوە فەرمووی:– دەمەوێت سەردانم بکەیت لە ماڵەکەی خۆم .. چونکە زۆر پێویستە .. ئاه بە داخەوە من ناتوانم سەردانت بکەم وە پرسیار مەکە بۆچی چونکە ئەگەر هاتیت خۆت هۆیەکەی دەزانیت .. ئەم قسانەی بە دەنگێکی نزمی خەماوییەوە گوت .. بەڵام قسەکانی بە شێوەیەکی دڵنیایی یەوە دەکرد .. ڕێگەی ماڵی خۆیانی پێ گوتم .. لە دەرگام دا .. برا بچووکەکەی دەرگای کردەوە .. عبداللە لە کوێیە؟ عبداللە لە ژووری مێوانە فەرموو .. کوڕە بچووکەکە پێشم کەوت .. وە دەرگای ژووری میوانی کردەوە و کاتێك چوومە ژوورەوە سەرسام بووم.. ئەوە چی دەبینم!!!؟ عبداللە لەسەر کەروێتەیەکی سپییە .. بە تەنیشتییەوە گۆچانێکی داناوە .. ئامێرێکی لە پێدایە کە یارمەتی دەدات بۆ ڕێکردن .. کۆمەڵێك دەرمانی بە تەنیشتەوەیە .. بەڵام خۆی وەکو لاشەیەك فرێدراوەتەوە سەر جێگەکەی .. پێی گوتم:– سڵاوت لێ بێ.. هەوڵی دا هەستێتە سەر پێ بە مەبەستی بە خێر هاتنم .. سڵاوی خوات لێ بێ مامۆستا .. سڵاوی خوات لێ بێ .. بە ڕاستی ماندوومان کردی.. نەخێر بە هیچ شێوەیەك ماندوو نەبووم .. ببورە نەمزانیوە

جەنابت نەخۆشیت ... بەڵام چیت بەسەر هاتووە؟ چی روویداوە؟ ئایە تۆ کۆلێژت تەواو نەکرد؟... ئەی بە منت نەگوت کە دەتەوێت ژن بهێنی؟.. چی دەکەم و چی دەکەم.... بەڵێ گوتم بەلام چەند رووداوێکی چاوەڕوان نەکراو روویدا... کاتێ کۆلێژم تەواو کرد ..خۆت دەزانی کە لە پێش چەند مانگێك بوو ...وە ئەوەی کە تووشی گەنجانی تر دەبێ لە خۆشی کردن بۆ تەواو کردنی کۆلێژ تووشی منیش بوو .. ئەمجار ژیانێکی نوێ دەستی پێ کرد ... لاپەرەیەکی نوێم بۆ دوارۆژێکی پرشنگداری خۆم کردەوە وە هەردەم خەریکی بیرکردنەوە بووم کە داخۆ ژیانی داهاتوم چەند خۆش دەبێت ... رۆژگار زۆر بە پەلە دەڕۆیشت ... هیچ شتێك ژیانی نوێی لێ تێك نەدەدام جگە لەسەر ئێشەیەکی کەم نەبێت کە هەندێ جار تووشم دەبوو ... لە پاش تێپەڕبوونی رۆژگار هەستم کرد سەرئێشەکەم زیاد دەکات بەلام چەند دەرمانێکی ئارام بەخش بەس بوو بۆ ئەوەی کە ئازارەکەم نەهێلێ .... رۆژگار تێدەپەڕێت و سەرئێشەکەم بەردەوامە بەلام راهاتبووم لە سەری وە زۆر جار لە یادم نەدەما هەرچەندە زۆر ئازاری هەبوو .. ئەم سەرئێشەیە رۆژ بە رۆژ زیاد دەکات و زیاد دەکات ئەمجار هەستم کرد کە چاوەکانم بەرەو کز بوون دەڕۆن ... تاکو ئەوەی شەوێك زۆر ئازاری دام ... بۆیە رۆیشتم بۆ بەشی فریاکەوتن لە یەکێك لە نەخۆشخانەکان .. وە دەردی خۆم بۆ پزیشکی پسپۆر گێڕایەوە .. چەند شیکاری وچەند تیشکێکی(أشعەی) پێویستی بۆ کردم ئەمجار گوتی:- پێویستمان بە چەند تیشکێکی ورد هەیە کە بەشەکانی سەر بە وردی تیادا بەدی دەکرێت ... وە ئێستا ئەو جۆرە تیشکەمان لە نەخۆشخانەدا نییە بۆیە برۆ بۆ نەخۆشخانەیەکی تایبەت تاکو ئەو تیشکەت بۆ دەکەن ئەمجار بگەڕێرەوە بۆ لام .. بەلام هەوڵ بدە بە پەلە ئەو کارانە ئەنجام بدەی... لە نەخۆشخانە

دەرچووم هەندێ جار ترس دایدەگرتم ... هەندێ جار سەرسام دەبووم... ئەم پزیشکە بۆ بەم شێوەیە ماندووم دەکات؟ باشتر وابوو کە هەندێ دەرمانی ئارام بەخشم پێ بدات بۆ سەرئێشەکەم ..یان چەند دڵۆپێك بۆ چاوەکانم... وە کارەکە تەواو دەبێت.. ئەمجار لەگەڵ خۆمدا قسەم دەکرد .. ئایە پزیشکەکە و تیشکەکە فەرامۆش بکەم؟ .. وە خۆم بە پێنج ریال دەوا بکڕم و سەرئێشەکەم چاك دەبێتەوە و ئەمجار بڕۆمەوە بۆ ماڵ و بنوم ... ؟ یاخود بڕۆم تیشکەکە بگرم کە ئەو داوای کردووە و ببینم کارەکە لە کوێوە سەری دەردەچێت... لەگەڵ ئەم هەموو بیرۆکانەدا ڕۆیشتم بۆ نەخۆشخانە تایبەتەکە و تیشکەکەم گرد و ئەمجار گەڕامەوە بۆ لای پزیشکەکە .. کە بە دەستمەوە ئەو لاپەڕانە هەڵدەگرم کە هیچ لەو هەموو هێمایانە تێناگەم ....فەرموو دکتۆر ئەوە ئەو تیشکانەیە کە داوات کردبوو.. پزیشکەکە چاوێلکەیەکی ئەستووری خستە سەر چاوی .. ئەمجار ئەو پەڕانەی ئەم دیوو ئەو دیوو دەکرد .. ڕەنگی گۆڕا ... گوێم لێ بوو گوتی :- لا حول ولا قوة الا بالله .. ئەمجار چاوی بەرز کردەوەو گوتی:- فەرموو .. دانیشە... گوتم :- موژدەم بدەرێ ... خەیرە انشاء الله ؟!! ... گوتی :- خەیرە... انشاء الله خەیرە .. ئەمجار بێدەنگ بوو ... چاوەکانی بۆ من بەرز نەدەکردەوە ... تەلەفونەکەی هەڵگرد .. دەستی کرد بە پەیوەندی کرد بە کۆمەڵێك پزیشکی پسپۆڕ و گەورەوە و داوای لەوان کرد کە ئامادە بن ... لە پاش چەند خولەکێك شەش حەوت پزیشك ئامادە بوون .. هەموویان دەستیان کرد بە تێڕوانینی پەڕەکان و ئەنجامی شیکارییەکان .. دەیانڕوانیە تیشکەکە.. وە بە زمانی ئینگلیزی قسەیان دەکرد .. جار بە جاریش تەماشایەکی منیان دەکرد.. یەك کاتژمێر بەم شێوەیە ڕۆیشت .. وە من لە بارودۆخێکی خراپدام ... ئەمجار

یادەوەرییەكانم بە خەیاڵمدا دەهات ... ڕۆژگاری خۆم دەكەوتەوە یاد .. بەڵكو بیرم لە داهاتووی خۆم دەكردەوە.. خۆزگە بمزانیبایە بۆ گفتوگۆ دەكەن؟ ئەم پزیشكە بۆ ئەو هەموو بایەخەی بە من داوە ... ئەمجار دڵی خۆم دەدایەوە دەمگوت:– ئەوە پزیشك هەروایە هەموو كاتێك كێشەی بچووك گەورە دەكەنەوە هەر یەكێك لەوان دەیانەوێت بازووی خۆیم پێ نیشان بدات ... شیكاری...تیشك... كۆبونەوە ... وە ئەم هەموو كێشەیە چارەسەرەكەی ئاسانە یەك حەپ یان دوو حەپ لە جۆری (بندول) لەگەڵ دڵۆپێكی چاو و هەموو كێشەكە تەواو دەبێت ... چاوم بڕیبووە پزیشكەكان بە وردی چاودێری ئەوانم دەكرد بۆ ئەوەی هیچ نەبێت شتێك بزانم ....بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو چاودێرییەم كەچی هیچ تێنەگەیشتم .. ئەمجار گفتوگۆكەیان كەم بووە وە بێدەنگییەك سەری كێشا بەسەر هەموویاندا .. یەكێكیان لە عیادەكە دەرچوو .. یەكێكی تر شوێنی كەوت.. ئەمجار سێیەم ... تاكو كار گەیشتە ئەوەی تەنها دووانیان مایەوە ... یەكێكیان پێی گوتم:– گوێ بگرە عبدالله .. تۆ لەوە گەورەتری كە پێت بڵێین باوكت بهێنە.. گوتم:– خەیر انشاء الله دكتۆر .. مەبەستت چییە؟ بە دڵنیایی یەوە گوتی:– ئەو ڕاپۆرت و تیشكانە نیشانی دەدەن كە (وەرەم) شێرپەنجەیەك لە سەرتدایە قەبارەكەی بە شێوەیەكی ترسناك ڕوو لە زیاد بوون دەكات ... ئێستا فشاری خستووەتە سەر دەمارەكانی چاوت لە ناوەوە.. لە هەر ساتێكدا ئەگەری ئەوە هەیە كە ئەو فشارە زیاد بكات و دەمارەكانی چاوت لە ناوەوە بتەقێنێت تۆیش تووشی كوێربوون ببیت .. ئەمجار مێشكت لە ناوەوە تووشی خوێن بەربوون دەبێت .. ئەمجار دەمریت.. پزیشكەكە بێ دەنگ بوو .. بەڵێ بێ دەنگ بوو ... بەڵام دوایین وشەی لە گوێمدا دووبارە دەبووەوە .. دەمریت ... دەمریت ... ئەی

هـاوااار .. ئـەم وشـەیە چـەند سـەختە ... چـەند کاریگـەری هەیـە لەسـەر نـاخی مرۆڤـــ... دەمــرم .. بــەڵێ دەمــرم... بــەڵام ئــەی گەنجێتییەکــەم؟... ئــەی مووچەکەم؟.. ئەی کارەکەم؟... دایکم ؟... باوکم؟... دەمرم؟... !! بە هـەموو دەنگم هاوارم کرد ... ئەی دکتۆر ... چی؟؟ چۆن؟ کەی.؟؟ وەرەم؟ کەی تـوش بوومە؟ هۆیەکەی چییە؟ من لەم تەمەنەدام؟ پەنا بە خـوا، وەرەم؟ شێرپەنجە؟ لا حـول ولا قـوة الا بـالله ... گـوتی:- بـەڵێ وەرەم.. وە دەبێـت بـە زووتـرین کـات چارەسـەری بکـەین... هـەر خولـەکێك... وە هـەر چرکەیەك.. کـە دەڕوات .. لـە بەرژەوەندی تۆ نییە .. هەر ئەم شـەو دەبێت بتخەینـە نەخۆشخانەوە... وە هـەر تـەحلیلێکی پێویـست هـەبێت تـەواوی دەکـەین ... وە بـۆ سـبەینێ انـشاء الله نەشتەرگەری سەرت دەکەین و وەرەمەکە دەردەهێـنین ... پزیشکەکە ئـەم چـەند وشەیەی زۆر بە دڵنیایی و ساردەوە گوت .. گوتی ..( لە کاتێکدا کە چاوێلکەکەی خۆی دەسڕی و بە چاوەکانی لـە پـەڕەکانی بـەر دەسـتی دەڕوانـی) ... بـەڵام مـن تەنها بە گوێم گوێبیستی ئـەو نـەبووم بەڵکو وا هەستم دەکـرد کـە هـەموو لاشـەم ببونە گوێ و گوێبیـستی ئـەو دەبـوون و لـە قسەکانی تێدەگەیـشتم .. پزیـشکەکە بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی خۆی:- ... ئـارام بگـرە .. داوای پاداشـت لـە خـوا بکە.. تۆ تەنها کەس نیت کە ئەم شێوە نەشتەرگەرییەی بـۆ دەکـرێ .. خـەڵکێکی زۆر ئەم نەشتەرگەرییەیان بۆ کراوە و سەرکەوتوو بـووە بـە پـشتیوانی خـوا .. تـۆ گەنجێکی ئیمانـدار و دانـای .. کەسـێکی وەك تـۆ پێویـست ناکـات مـن ئامۆژگـاری بکەم بۆ ئارام گرتن و دامەزراوبوون .. پزیشکەکە بەردەوام بوو لەسەر قـسەکانی و تەماشای منی دەکرد .... بەڵام من .... هەردوو چـاوم دەربـەڕیبوون بەرامبـەر بـە چاوەکانی ... بەڵی زۆر بە وردییەوە تەماشـای ئـەوم دەکـرد ... قـسەکانی دوایـین

تێکەڵی قسە کۆنەکانی بوو بوون ... هیچ وشەیەك لە قسەکانی لە یادمدا جێگیر نەبووبوو تەنها... وەرەم ... شێرپەنجە... نەشتەرگەری ... چۆنە ئەگەر خوا لەسەرم نوسیبێتی لە کاتی نەشتەرگەرییەکەدا بمرم ؟ ...ئاخۆ دایکم چی دەکات؟ ئەی باوکم کە تەمەنی لە حەفتا ساڵ تێپەڕیوە؟ براکانم؟ خوشکە بچووکەکانم؟ بەڵکو چۆن بە تەنها بچمە ناو گۆڕەوە؟ ئەی چۆن بە سەر پردی (صراط)دا تێپەڕم؟ چۆن؟ وە چۆن؟ کوا پلانەکانم؟ .... بڕوانامەکەم؟ .... زەماوەند؟... کارە تازەکەم؟.. ئەمە چۆن لە ناکاودا روویدا؟ پرسیارێکی زۆر دەهاتە مێشکمدا.. وای لێ کردم وەکو ئەوەی لە دەریایەکی بێ کەناردا مەلە بکەم .. لە ناخی خۆمدا هاوارم کرد ..

﴿يَا حَسْرَتَى علَى مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ﴾ [الزمر: ٥٦] .

واتە:- ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو هەموو لادان و نادروستیانەی کە کردم لە فەرمان و بەرنامەی خوادا.. خۆزگە شتێکم ئامادە بکردایە بۆ دوارۆژم .. هەموو ئەو خۆشییانەی کە کۆم کردەوە .. هەموو ئەو پلە و پایانەی کە هەوڵم بۆی دەدا.. لە ناکاودا دەڕوات؟ .. ئا بەم شێوە و بە بێ پێشەکی؟ .. ئەم ژیانە چەند کورتە ! ! .. والله من لە لەخۆبایی بووندا بووم.. ئەوە چۆن شوێنی ئارەزووەکان دەکەوتم؟ وە کەوتبوومە ناو خۆشییەکانی ژیان ... وە دۆزەخ گڕ دراوە ... وە کۆت و زنجیرەکان ئامادە کراون ... و فریشتە کاربەدەستەکانی دۆزەخ ئامادەن.. لەناوچوون بۆ ئەم دونیایە ئەگەر کەمێك تێیدا پێ بکەنێت ئەوا زۆر تێیدا دەگرێیت... وە ئەگەر چەند رۆژێك خۆشحاڵ بیت تێیدا ئەوا چەند ساڵێك تێیدا خەمبار دەبیت .. وە ئەگەر کەمێك خۆشگوزران بیت تێیدا ئەوا زۆر نارەحەت دەبیت تێیدا ... دەستم کرد بە گازندەکردنی نەفسە تاوانبارەکەم .. گازندەیەکی

زۆر ... ئاه ه ه .. خەمەكانی سبەینێ چەند درێژن!! ئەی خودایە ڕەحمم پێ بكە.. ئەی خودایە ڕەحمم پێ بكە ... لە ناكاودا پزیشكەكە گوتی:- ئەمە پەڕەكانی نەشتەرگەرییەكەیە .. ئیمزایەكی بكە بۆ ئەوەی جێگایەكت بۆ بگرین... وە ئامادەت بكەین بۆ چوونە ژوورەوە بۆ نەخۆشخانە .... بە سەرسامی و بەرامبەری ڕاوەستا بووم ... گوتی:- بگرە .. ئەوەچییە؟! .. بگرە .. گوتم:- نەخێر ئیمزا لەسەر هیچ ناكەم .. گوتی:- چۆن؟ ئیمزا ناكەیت؟!! تۆ شێتیت؟ ئەمە بۆ بەرژەوەندی تۆیە نەك ئێمە ... وە زیانەكەی لەسەر تۆیە نەك لەسەر ئێمە ... وا نەزانیت كە ئێمە دەست بەتاڵین و چاوەڕوانی كەسێكین كاتی خۆمانی لەگەڵ بەسەر ببەین ... كارەكە زۆر گرنگە و ترسناكە ... گوتم:- نەخێر لەسەر هیچ شتێك ئیمزا ناكەم .... گوتی:- بە گشتی ئێمە ناتوانین زۆرت لێ بكەین ... بەڵام لەسەر ئەم پەڕەیە ئیمزا بكە بۆ ئەوەی ئێمە بەرپرسیار نەبین ئەگەر خوێن بەربونێكی لە ناكاودا ڕوویدا.. كە پەڕەكەم لێ وەرگرت بینیم تیایدا نوسراوە....(من كە لە خوارەوە ئیمزا دەكەم لەسەر خواستی خۆم لە نەخۆشخانە دەرچووم ... هتد ...) ئیمزام لەسەر پەڕەكە كرد و دەرچوومە دەرەوە .. بەڵام بۆ كوێ بڕۆم ...؟ بۆ ماڵەوە بۆ ئەوەی هەواڵ بگەیەنمە دایك و باوكم؟ یان بگەڕێمەوە بۆ نەخۆشخانە؟ یان بڕۆم بۆ نەخۆشخانەیەكی تر؟ لا حول ولا قوة الا بالله ... پاش بیركرنەوەیەكی بە پەلە بڕیارم دا كە بڕۆم بۆ نەخۆشخانەیەكی تر... لە بەشی فریاكەوتن ... سلام علیكم ... ئەی دكتۆر .. من هەست بە سەرئێشەیەك دەكەم وە هەست بە لاوازی بینینی چاوم دەكەم .. لە پاش پشكنینێكی بە پەلە و ئەنجامدانی تیشكی پێویست .. پزیشكەكە گوتی:- پێویستمان بە تیشكێكی وردی سەرت هەیە .. وە ئێستا لە نەخۆشخانە نییە ... بەڵام بڕۆ بۆ عیادەیەكی

تایبەت و تیشکەکە ئەنجام بدە ... ئەمجار بگەڕێرەوە بۆ لام.. وە هەوڵ بدە ئەو کارە بە پەلە ئەنجام بدەی ... پزیشکەکە ئەمەی گوت و بێ دەنگ بوو ... منیش دابەزیم بۆ لای ئۆتۆمبیلەکە و تیشکەکەم دەرهێنا و بردم بۆ لای پزیشکەکە ... کە بینی گوتی:– سەیرە .. چۆن وا بەم زووە گەڕایتەوە؟ بۆ تیشکەکەت ئامادە نەکرد؟ گوتم:– ئامادەم کردووە پێش ئەوەی بێم بۆ لای تۆ ... وە ئەوەتا لە بەردەستت دا ... پزیشکەکە پەڕەکانی لێ وەرگرتم و ئەم دیو ئەودیوی دەکرد..من لە سەر کورسییەکە دانیشتم چونکە پییەکانم نەیدەتوانی هەڵم بگرێ... بەڵام لە جاری یەکەم دامەزراو تر بووم ... یادی خوای گەورەم دەکرد... پاکی و بێ گەردی بۆ خوا ... الحمد لله .. لا الـه الا الله .... اللـه اکبر ... استغفر الله.. استغفر الله ... یادی ئەو وەسێتەم دەکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە کوڕی مامی فەرموو (کە عبدالله ی کوڕی عەباسە) (وەبزانە ئەوەی کە تووشت دەبێت نابێت لەسەرت تێبپەڕێت و ئەوەی کە تێبپەڕێت نابێت تووشت ببێت وە بزانە کە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە وە لە پاش هەموو ناخۆشییەك خۆشییەك هەیە)[٢].... بۆیە کارەکە لەسەرم سووك بووەوە ونەفسی خۆمم دڵنیا دەکردەوە... چی ڕوودەدات؟ وەرەم!! من یەکەم کەس نیم و دڵنیام کە دوایین کەسیش نیم ... دایکم ... باوکم ... براکانم ... ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ دەگرین و پاشان لە یادیان دەچێ .. لە ناکاودا پزیشکەکە تەلەفونەکەی هەڵگرد و کۆمەڵێك پزیشکی پسپۆری بانگ کرد بۆ عیادەکەی خۆی .. هاتن ... تەماشای پەڕەکانیان کرد ... قسەیەکی زۆریان کرد .. چاوەڕوانی هەواڵێکی ترسناك بووم .. بەڵام زۆر تێك نەچووم ...کارەکەی خۆم بە خوا سپارد ... دیسان خەیاڵاتی زۆر بە میشکمدا

---

(٢) (ظلال الجنة: رقم: ٣١٥) .

دەهات . بۆ من بە تایبەتی تووشی ئەم نەخۆشییەترسناكە ببم؟... خەڵكی زۆر هەن .. ئەمجار لە ناخی خۆمدا هاوارم كرد ... پەنا بە خوا .. كێ دەڵێ قسەی ئەو پزیشكە تەواو بێت رەنگە هەڵەی كردبێت ... سەر ئێشەیەكی زۆرە و ئەمجار نامێنێ ... زۆر چاوەڕوان بووم، رووم كردە پزیشكەكە و پرسیم ... ها دكتۆر مژدەم بدەرێ دەنگ و باس چییە؟ بە دەنگێكی لەسەر خۆ گوتی:– هەندێ چاوەڕوان بە وئارام بگرە .. دیسان لە خەیاڵاتی خۆمدا بە جێی هێشتم .. لەگەڵ هاوەڵەكانیدا بە زمانێكی تر قسەی دەكرد ... پاش نزیكەی یەك كاتژمێر قسەكانیان تەواو كرد و یەكێكیان دەرچووە دەرەوە و ئەمجار دووان وسیان ... پزیشكەكە رووی تێ كردم و گوتی:– گوێ بگرە عبدالله ... تۆ گەنجێكی ئیمانداری و هەموو شتێك بە قەزا و قودرەتی خوا روو دەدات .. ئەم راپۆرت و تیشكانە نیشان دەدەن كە وەرەمێك لەناو سەرتدا هەیە .. قەبارەكەی بەشێوەیەكی ترسناك روو لە زیاد بوون دەكات .. ئێستا لە ناوەوە فشاری خستووەتە سەر دەمارەكانی چاوت وە لە هەر ساتێكدا ئەو فشارە زیاد دەكات و دەبێتە هۆی بچڕاندنی ئەو دەمارانە و پاشان تووشی كوێر بوون دەبیت .. ئەمجار لە ناوەوە تووشی خوێن بەر بوون دەبی وپاشان دەمریت ... بۆیە دەبێ هەر ئێستا بڕۆی بۆ نەخۆشخانە و هەر ئەمشەو بڕۆیتە ژووری نەشتەرگەری و كەمێك لە ئێسكی سەرت لادەدەین و وەرەمەكە دەردەهێنین .. ئەمجار جارێكی تر ئێسكەكە دەخەینەوە جێگەی خۆی .. پزیشكەكە بێ دەنگ بوو .. بەڵام ئەمجارە قسەكەی لە سەرم سووك تر بوو لە جاری یەكەم هەواڵەكەم بە ئاسایی و هێمنی وەرگرت بۆیە پزیشكەكە سەرسام بوو .. .تەلەفونەكەم هەڵگرد و پەیوەندیم كرد بە باوكمەوە .. باوكم هات ... كابرایەكی گەورەی تەمەنی لە حەفتا ساڵ زیاترە ..شۆفێركە

ئامادەی کرد ... چونکە بە چاوە کزەکانییەوە ناتوانێ ئۆتۆمبیل لێخوڕێ... چەند ماندوو بووە لەگەڵ چاودێری و پەروەردەی ئێمەدا!.. خوا پاداشتی بە خەیری بداتەوە ... کە باوکم منی بینی ... سەرسام بوو.. بە هۆی تێك چوونی رەنگ و زەرد بوونی چاومەوە .. هێشتا بە پێوە بوو گوتی:- چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟ بۆچی هاتووی؟ و ...؟ گوتم:- باوە گیان تۆ دەزانی ماوەیەکە تووشی سەرئێشەیەکی بەردەوام بووم .. بۆیە منیش چووم بۆ نەخۆشخانە .. وە چەند پشکنینێکیان بۆ کردم .. ئەمجار منیش هاتم بۆ ئەم نەخۆشخانەیە وە لە پاش پشکنین پێیان راگەیاندم کە لە ناو سەرمدا وەرەمێك هەیە وە دەبێت نەشتەرگەرییەکی بە پەلەی بۆ بکەن .. باوکم گوێ بیستی ئەم قسانە بوو .. بەلام ئەو لە من زیاتر بێ ورە بوو .. هاواری کرد .. وەرەم ...؟ وەرەم ..؟ لا حول ولا قوة الا بالله .. ئەمجار لەسەر زەوییەکە دانیشت .. لەبەر خۆیەوە دەیگوت .. انا لله وانا الیە راجعون .. دەبێ بتنێرین بۆ ئەمەریکا و لەوێ لەگەڵ براکەتدا چارەسەر بکرێیت .. لا حول ولا قوة الا بالله .. ئەم قسانەی گوت و لە هەمان کاتدا یادی سالانی پێشووی دەکردەوە کە چەند ماندوو بوو لەگەڵ (عبدالرحمن) ی برامدا کە ئەویش تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووە و ئێستا لە ئەمەریکا چارەسەری بۆ دەکەن ... چەندەها جار باوکمم دەبینی لەگەڵ براکەمدا بە تەلەفون قسەی دەکرد و دەگریا ... چەندەها جار لە نیوەشەواندا دوعای بۆ دەکرد .. لە نوێژەکانیدا .. بە راستی خەمەکانی بە باوکمەوە دیار بوو.. بە تایبەتی ئەو کاتەی کە منداڵەکانی عبدالرحمن ی برام پرسیاری باوکیان دەکرد..باپیرە باوکمان لە کوێیە؟ بۆ ئێمەیش وەکو مندالانی تر باوکمان نییە؟ تەماشای باوکم کرد فرمێسکەکانی بە روویدا دەهاتە خوارەوە ... تەماشای

منداڵەکانی دەکات یەك لە دوای یەك لە بەر دەستیدا دەمرن ... چونکە (خالد) ی برام پێش دوو ساڵ بە ڕووداوی ئۆتۆمبیل کۆچی دوایی کرد .. وە ئێستا (عبدالرحمن) ی برام لە ئەمەریکا ململانێ دەکات لەگەڵ مردندا .. منیش لە سەرەتای ڕێگاکەم و ئەنجامەکەی نادیارە ... باوکم رووی کردە پزیشکەکە و هەوڵی دەدا کە ئارامگر بێت و پرسیاری دەکرد دەربارەی ترسناکی نەخۆشییەکە.. بەڵام سۆزی باوکایەتی بە هێزتر بوو.. فرمێسکەکانی بە ڕووی دا هاتە خوارەوە.. پزیشکەکە گوتی:- ئەی باوکی عبدالله خەم مەخۆ .. کارەکە ئاسانە انشاء الله.... دڵنیابە ...باوکم گوتی:- ئەی دکتۆر ئەو پەڕەو پشکنینانەی کە تایبەتن بە عبدالله دەمانەوێت چونکە دەبێ سەفەر بکات بۆ ئەمەریکا و لەوێ لەگەڵ براکەیدا چارەسەری بکەن ... پزیشکەکە بەوە رازی بوو ... باوکم پەڕەکانی وەرگرت ... وە جێگام بۆ گیرا بە پەلە ... وە سەفەرم کرد بۆ ئەمەریکا لەگەڵ عبدالعزیزی برامدا ... ئێوارە بوو گەیشتینە نەخۆشخانە .. هەر پشکنینێك و شیکارییەك پێویست بوو ئەنجامیان دا ... هەموو شتێك بە پەلە ڕوویدا ... وە بۆ سبەینێ بردمیان بۆ ژووری نەشتەرگەری .. چەند ژوورێکی ترسناکە!! ... چەندەها ئامێر لێرە و لەوێ .. چەقۆ .. مەقەص.. هەرە (مشارط) . وام دەزانی لە ژووری کرانەوەدام ... چەند ڕوویەکی بێدەنگن؟... چاوەکانیان تەماشایان دەکرد بە پەرۆشەوە هەروەکو ئەوەی کە نێچیرێك کەوتبێتە بەردەستیان ... دەستی پزیشکەکان لەگەڵ خوێندا راهاتون من ناتوانم لەگەڵ خۆمدا هیچ کارێك بکەم بەڵکو ئەوان چییان بوێ دەیکەن ... لەسەر جێگەیەك هەڵیان گرتم بۆ سەر جێگای نەشتەرگەرییەکە ... بسم الله ..لا الە الا الله ... یادی خوای گەورەم زۆر دەکرد ... چاوەڕوانی دەست پێ کردنی نەشتەرگەرییەکە بووم ... تەماشای

ڕووی ئەوانەم دەكرد كە لە دەوروبەرم بوون ... دەستم بەرز كردەوە بۆ سەرم .. دەستم پیاداخشاند ... چەند بەستەزمانە سەرم !!.. ئاخۆ پاش كەمێكی تر حاڵت چۆن دەبێت؟! ... پەرستیارەكان ڕاوەستا بوون، چاوەڕوان بوون ... وادیارە ئەو پزیشكەی كە نەشتەرگەرییەكە ئەنجام دەدات جارێ نەهاتووە ... لە ناكاودا دەرگای ژووری نەشتەرگەرییەكە كرایەوە و كابرایەك هاتە ژوورەوە تەنها هەردوو چاوی دیار بوو ....تەوقەیەكی لە گەڵمدا كرد .... ئەمجار دەستنیشانی یەكێكی كرد كە دەرزییەكی گەورەی بۆ ئامادە بكەن (بەڵێ سوێند بە خوا زۆر گەورە بوو) ئەمجار توند چەقاندی بە ڕانمدا ... چیتر ئەوە دوا ساتەكانم بوو لەگەڵ دونیادا ...چوومە ناو ژیانی بێ ئاگا بوونەوە ... پزیشكەكە سەری تەراش كردم ...ئەمجار بە شێوەیەكی بازنەیی پێستی سەری بڕیم... پاشان دەستی بە بڕینی ئێسكەكانی سەرم كرد... تاكو پارچەیەكی لێ لادا.. ئێسكەكەی بە تەنیشتی خۆیەوە دانا ... ئەم پارچە ئێسكە زۆر بچووك نەبوو بەڵكو بە قەبارەی قاپێكی بچووك بوو ..پاشان وەرەمەكەی دەرهێنا ... كە قەبارەكەی لە هێلكەیەك گەورە تر بوو .. تاكو ئێستا كارەكان بە ڕێك و پێكی دەڕوات ... لە ناكاودا...خوێن لە دەمارەكانی مێشكمدا تێك چوو ... ئەمجار خوێن لە خوێنبەرەكەمدا وەستا و توشی جەڵتەی دەماغ بووم ... ئەمجار پزیشكەكە ژڵەژا ئەو دەمارانەی كە پەیوەندیان بە (مۆخی بچوكەوە هەبوو بە هەڵە جوڵاندی بۆیە لایەكم توشی ئیفلیجی بوو كە بەشی چەپی لاشەم بوو .... كاتێ كە پزیشكەكە ئەمەی بینی بە پەلە نەشتەرگەرییەكەی تەواو كرد ... وە بە پەلە پارچە ئێسكەكەی گەڕاندەوە جێگەی خۆی ... وە پارچە پێستەكەی كردە جێگەی خۆی وە جێگاكەی دوورییەوە ... ئەمجار منیان هەڵگرد لەسەر جێگای نەشتەرگەرییەكە

و خستمیانە جێگەیەکی تر، وە منیان بەرەو ژووری بوژانەوە برد کە پێی دەگوترێت (إن عاش) لە پاش نەشتەرگەرییەکە ماوەیەك بێ هۆش مامەوە بۆ ماوەی پێنج کاتژمێر ... وە لە ناکاودا پێی چەپم توشی جەڵتە بوو .. دیسان بە پەلە بردمیان بۆ ژووری نەشتەرگەری و لەوێ سنگمیان کردەوە فلتەرێکی بچووکیان خستە سەر یەکێ لە خوێنبەرەکانی دڵم .... جارێکی تر گەڕاندمیانەوە بۆ ژووری بوژاندنەوە (إن عاش) بۆ ماوەی چوار کاتژمێر حاڵم جێگر بوو ... ئەمجار سییەکانم توشی خوێن بەربونێکی توند بوون .. !! بۆ جاری سێیەم بەرەو ژووری نەشتەرگەری بەڕێیان خستم (ڕەنگە جاری چوارەم بووبێ) دیسان سنگمیان کردەوە وە سییەکانمیان لە خوێن پاك کردەوە وە چارەسەری خوێن بەربوونەکەیان کرد .. دیسان گەڕاندمیانەوە بۆ ژووری بوژاندنەوە. پزیشکەکە سەرسام بوو بە کارەکە .. چەند نەخۆشییەك یەك لە دوای یەك... حاڵەتێك کە بە پەلە گۆڕانکاری بە سەردا دێت ... ڕووداوی لە ناکاو کە کۆتایی نییە ... بۆ ماوەی بیست و چوار کاتژمێر حاڵەتم جێگر بوو .. پزیشکەکە هەستی بە شتێك کرد ... کە دڵخۆشی پێوە دیار بوو .. لە ناکاودا ... پلەی گەرمی لەشم بە شێوەیەکی ترسناك بەرز بووەوە .. پزیشکەکە بە پەلە پشکنینێکی بۆ کردم لە پاش پشکنینێکی ورد بۆی دەرکەوت کە ئەو ئێسکەی وەرەمەکەی لە ژێری دەرهێنا توشی هەوکردنێکی زۆر بوو ... وە دەبێ دەربهێنرێت و پاك بکرێتەوە .. پێش ئەوەی ژەهراوی بوون ڕووبدات لە مێشکمدا ... پزیشکەکە بانگی گروپی پزیشکانی نەشتەرگەرییەکەی کرد.. ئەمجار وەکو لاشەیەکی بێ گیان هەڵیان گرتم... وە فڕێمیان داوە سەر جێگەیەك لە ژووری نەشتەرگەری...دەستم کرد بە تەماشاکردنی ئەوان ... هیچ شتێکی خۆم بە دەستی خۆم نییە ... هەموو

کارەکەم دا بە دەستی خوا ... گریان زاڵ بوو بە سەرما .. دەستم بە گریان کرد.. خۆزگەم دەخواست کە دایکم و باوکم ببینم تاکو دەستیان ماچ بکەم .. بەڵکو سوێند بە خوا تاکو پێیان ماچ بکەم ... پێش ئەوەی دونیا بە جێ بهێڵم .. داوام لە خوا کرد و پەنام پێ گرد .﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ [الأنبياء: ٨٣].

واتە:– پەروەردگارا، بە راستی من ئازار و ناخۆشیم تووش بووە، تۆش لە هەموو کەس میهرەبانتر و لە هەموو کەس دلۆڤانتریت رەحمم پێ بکەیت...

ئەمجار چاوم بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و گوتم:– (یا ارحم الراحمین ).. ئەگەر ئەمە تۆڵەیە لێم دەسێنی داوات لێ دەکەم کە لێم خۆشبی و بمبورە.. وە ئەگەر بەڵایە ئەوا داوات لێ دەکەم کە ئارامیم پێ ببەخشی ... وە پاداشتی خەیرم بدەرەوە ... ئەمجار گریان زاڵ بوو بە سەرمدا ... بۆیە برینپێچەکان هاواریان بە سەرمدا کرد بە زمانێك کە نەمدەزانی چی دەڵێن... بەڵام دەمزانی داوام لێ دەکەن بێ دەنگ ببم ... بۆیە هەوڵم دەدا زاڵ بم بەسەر خۆمدا ... وە ئارام بگرم .... بیرم لە مردن کردەوە ... بیرم لە نەمانی خۆشییەکان کردەوە .. چەندە دونیا گاڵتەی پێ کردم .. تاکو رۆژگارەکانم رۆیشت ... هەرچەند ئامۆژگاریمیان بکردبایە .. دەمگوت:– بەم زووانە تەوبە دەکەم کەچی نەمکرد ... لاوێتیم لەخۆباییبوونی کردم .. جوانی ئۆتۆمبیلەکەم .. جل وبەرگەکەم .. وە خۆ ئامادەکردنم لە بیر چوو بۆ ژیانی دوارۆژ .. سوێند بە خوا کێشەکەم زۆر گەورەیە.. وە هێزم لێ براوە ... وە سبەینێ گڵ دەبێتە جێی خەوتنم ... خۆزگە لەو کەسانە بوایەم کە شەو نوێژیان دەکرد ... ئەوانەی کە یادی ئاگر خەویان لێ حەرام کردبوو ... وە تەماحی بەهەشت وای لێیان کردبوو کە هەردەم بە رۆژوو بن... بۆیە لاشەیان لاواز بووە و رەنگیان گۆڕاوە ... یادی رۆژی زیندووبوونەوە و

قیامەتم كرد .. وە ئەو ساتەم هاتەوە یاد كە هەموو هەڵدەستینەوە بۆ گۆڕەپانی مەحشەر ...هاوار بەماڵم ... ڕۆژی قیامەت حەسرەتی تیادایە ... وە لە حەشردا ئاهوناڵە هەیە ... وە لەسەر (صراط) پێ خلیسكان هەیە .. وە لەسەر تەرازوو فرمێسك هەیە ... وە ستەمیش لەو ڕۆژەدا تاریكییە ... وە كتێبەكانیش بچووكترین تەماشای حەرامی تیادایە .. وە ناخۆشی گەورە ئەو ساتەیە كە خراپەكان دەخرێنە ڕوو .. كۆمەڵێك لە بەهەشتدا بە پلەكانیدا سەردەكەون ... وە كۆمەڵێك لە دۆزەخدا بە پلەكانیدا دەڕۆنە خوارەوە ... وە لە نێوان من و ئەو جێگایەدا هیچ شتێك نییە تەنها ئەوە نەبێت كە بڵێن:- فلان مرد ... وە دەترسم هاوار بكەم و بڵێم ﴿رَبِّ ارْجِعُونِ﴾ [المؤمنون: ٩٩] .

واتە:- پەروەردگارا بمگێڕەرەوە بۆ دنیا .. ئەوانیش بڵێن تەمەن ڕۆیشت.. سەیرە بۆ مردووەكان!... شتیان زۆر كۆ كردەوە كەچی ئەوەیان كە كۆكردەوە نەیانخوارد ... وە خانووی جوانیان كرد كەچی نیشتەجێ نەبوون تیایدا...لەاوچوون بۆ ئەم دونیایە ... سەرەتاكەی ماندوو بوون و هیلاكییە .. وە كۆتاییەكەی نەمانە .. حەڵاڵەكانی لێپرسینەوەی لەسەر دەكرێیت ... وە حەرامەكەیشی سزای بە دواوەیە .. بیرم لە حاڵی خۆم دەكردەوە ... تەمەنم دیاری كراوە ... وە نەفسەكەم دیاری كراوە ... وە لاشەكەم لە پاش مردنم لەگەڵ كرمدایە ... ئاه ه ه ه... ئەگەر ڕۆژی قیامەت پێم خلیسكا ... وە دەنگی گریان بەرزەوە بوو ... وە پەشیمانی زۆر درێژەی كێشا ... هاوار بۆ خۆم .. ئەگەر یەكێك بێت بۆ لام و پرسیارم لێ بكات دەربارەی بچووك و گەورە .. ئەو ڕۆژەی كە سەرپێچی كەران پێیان دەخلیسكێ .. وە ئازار و ناڵەو هاوار زۆر دەبێت ...وە خۆشییەكان هەروەكو خەو وابوون نامێنن ... ئەمجار گریام ... بەڵێ .. گریام و

حەزم دەکرد کە لە دونیادا بمێنمەوە ... نەك بۆ ئەوەی لە خۆشییەکانی تام و چێژ وەربگرم ... بەڵکو بۆ ئەوەی کە پەیوەندیم لەگەڵ خوای خۆمدا چاك بکەمەوە ... لە ناکاودا ... پزیشکەکە بەرەو لام هات ... ویستم پرسیاری لیّ بکەم دەربارەی نەخۆشییەکەم ... وە هەموو نەخۆشییە یەك لەسەر یەکەکان هۆکەی چییە؟ .. بەلاّم رووی لیّ نەکردم ... وە داوای کرد کە بەنجێکی گشتیم بۆ بکەن ... کە ئاگام لەم دونیایە نەما ... چەقۆ و شفرەکانی دەرهێنا ... ئەمجار ئەو پێستەی کە لەسەر سەرم بوو لایدا ... وە ئێسکەکەی دەرهێنا و بە تەنیشتی خۆیەوە داینا .. ئەمجار پێستەکەی خستە سەر سەرم بە بیّ ئێسك ...دووریەوە.. ئەم نەشتەرگەرییە چەند کاتژمێرێکی خایاند . پاشان هەڵیان گرتم ... وە لە ژووری بووژانەوە خستمیانە سەر جێگایەك .. کاتیّ بە ئاگا هاتمەوە ... بینیم ئەو هەموو ئامێرە بە دەور و بەرمدا دانراوە ... ئەمە بۆ پێوانەی هەناسەدانە .. ئەوە بۆ پێوانەی پاڵەپەستۆی خوێنە ... سێیەم بۆ لێدانی دڵە ... وە چوارەم... پەرستیارەکان لە هەموو لایەکەوە دەوریان گرتووم .... سەرسام بووم بەم دیمەنانە ... من لە کوێم ..؟ بە سەرسامی مامەوە ... ئەمجار کەوتە یادم کە من لە ئەمریکام ... وە من لە ژووری نەشتەرگەری بووم ... دەستم بەرز کردەوە بۆ سەرم هەستم کرد کە سەرم نەرمە ... ئێسکەکە لە کوێیە؟! دوێنیّ سەرم تەواو بوو .. گریام ... پرسیارم لە پزیشکەکە کرد ئەو بەشەکانی سەرم لە کوێیە؟ بە ساردییەکەوە گوتی:– پارچە ئێسکەکەی سەرت لای ئێمە دەمێنێتەوە بە مەبەستی پاك کردنەوە وە لە پاش شەش مانگی تر دێیتەوە بۆ لامان بۆ ئەوەی بیخەینە جێگەی خۆی .. چەند رۆژێك لە ژووری بووژانەوە مامەوە ئەمجار لەویّ دەرکرام ... یەك مانگی تەواو لە ئەمریکا مامەوە ... ئەمجار گەڕامەوە بۆ (ریاض)

وە ئێستا من چاوەڕوانی تەواو بوونی شەش مانگەکە دەکەم بۆ ئەوەی پارچەی سەرم بگەڕێنمەوە... ئەمجار عبدالله بێ دەنگ بوو .. وشەکانی بە ئاستەم دەردەچوو ... وە ماف خۆیەتی گەر بگرێت ... بەڵام من ... گوێبیستی ئەم وشانە بووم ... وە من لەو پەڕی سەرسام بووندا بووم لە گۆڕانی زەمانە بەسەر خاوەنەکانیدا ...لە پاش ئەوەی گەنجێکی بە تواناو بە شان و شەوکەت بوو ... روویەکی گەش و جوان .. لە نێو پارەیەکی زۆردا ژیانی دەبردە سەر ... لە نێو کارەکەیدا ... لە تەندروستیدا ... خێزانێکی بەختەوەر ... . کەچی ئێستا کەوتووەتە ئەم حاڵە .. پاکی و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی کە هەموو کارەکان بە دەستی خۆیەتی ... چەند ناخۆشە ئەم دونیایە؟! ... بە راستی دواڕۆژ رۆژی ژیانی بەردەوامە ... چەند رۆژێك تێپەڕی .. منیش هەموو جارێك سەردانم دەکرد... لەگەڵ چارەسەرکردنیدا سوپاس بۆ خوا کە شەلەلەکەی باش بووەوە و توانی چیتر رێ بکات ... ماوەیەك لێی برام.. ئەمجار رۆژێك پەیوەندی پێوە کردم کە دەیەوێت سەفەر بکات بۆ ئەمریکا بە مەبەستی گەڕاندنەوەی پارچە ئێسکەکەی سەری .. پاش گەڕانەوەی سەردانم کرد بینیم رووی خۆش و گەشاوەیە .. سوپاس بۆ خوا کە پارچە ئێسکەکەی سەری گەڕاندەوە .. وە ئەمجار بانگهێشتی کردم بۆ ئاهەنگی ژنهێنانی ... بەڵام ئێستا حاڵی ئەم گەنجە زۆر باشە و یەکێکە لە پیاو چاکان ... بەڵکو یەکێکە لەوانەی بانگەواز دەکەن بۆ دینی خوا .. یەکێکە لەوانەی کە بە هەموو ئەوەی کە هەیانە خزمەتی ئەم دینە دەکەن... ئەگەر تەماشا بکەی دەبینی خەریکی کۆ کردنەوەی پارەیە بۆ هەژاران .. زەکات کۆ دەکاتەوە و دابەشی دەکاتە سەر هەژارانە... بەڵکو خەریکی رێکخستنی کات و

شوێنی وانە وتنەوەی بانگەوازکاران وە یارمەتی دانی نوسەران بۆ چاپ کردنی کتێب و بڵاوکردنەوەی ... جگە لە دەیان دەرگای تری خەیری چاکە:

﴿فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾ [النساء: ١٩] .

واتە:- ئەوە دوور نییە و دەشێت حەزتان لە شتێك نەبێت و خوا بیکات بە مایەی خێر و بێری زۆر و بێ سنوور .

داوا لە خوا دەکەم کە من و ئەو و تۆ و هەموو موسڵمانان دامەزراو بکات لەسەر دینەکەی ...آمین

...لەپاشاندا ..

برای بەڕێزم ......خوشکی بەڕێزم ...

نازانم چۆن لەگەڵ تۆدا دەست بە قسەکردن بکەم؟... نازانم ئایە قسەکانم لێ وەردەگریت؟... بەڵام ناچارم دەبێ پێت بڵێم ... چونکە تۆ برایەکی موسڵمانی منی وە مافی ئەوەت بە سەرمەوە هەیە کە ئامۆژگاریت بکەم و ڕێنیشاندەرت بم ... سوێند بە خوا من ئەم چەند وشەم نەنوسیوە تەنها لەبەر ئەوە نەبێت کە ئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە لە چاکە بۆ تۆیش پێم خۆشە .... بۆیە نیەتت باش بێت بەرامبەر بە من ..وە پەلە مەکە و کاغەزەکانم مەدڕێنە .. تۆ بەندەیەکی خوای گەورەی ڕۆژانە پێنج جار لەبەر دەستی خوادا رادەوەستی ... وە دڵنیابە کە هیچ زەڕرەیەك لە زەڕرەکانی لەشت بەڵکو هیچ هەناسەیەك لە هەناسەکانت بە بێ ئیزنی دروستکەرەکەت ناجوڵێتەوە ... ڕۆژێ پرسیارت لە خوت کردووە ... ئایە نێوان من و ئەو چۆنە؟ پەیوەندیمان چۆنە؟ ئایە ئەو لە من رازییە؟ یان نا؟ ئایە بە یەك گەیشتنمان لە ڕۆژی دواییدا چۆن دەبێت؟ تۆ تەنها خۆت دەتوانیت وەڵامی

ئەم پرسیارانە بدەیتەوە ... ئەوەیش بزانە کە .. خۆ خەریك كردن بە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی و وازهێنان لە قەدەغەلێکراوەکان ... تاکە ڕێگایە بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بەڵکو تاکە ڕێگایە بۆ چوونە ناو بەهەشت ... پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:-

(کل أمتي يدخلون الجنة إلا من أبى . قالوا ومن يأبى؟ قال: من أطاعني دخل الجنة، ومن عصاني فقد أبى)[٣] •

واتە: هەموو ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە تەنها ئەوانە نەبێ کە نایانەوێ .. فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێ نایەوێ؟ فەرمووی:- هەرکەسێ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی من بێت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە و هەرکەسێ سەرپێچی بکات ئەوا نایەوێ .. ئەمە یەکەم ئامۆژگارییە بۆ هەر کەسێ کە بیەوێ ببێتە ئەهلی بەهەشت ... دڵنیا بێت کە لەم دونیایە تەنها ڕێبوارێکە ... وە دوا ڕۆژ جێگای بەردەوامی و جێگیر بوونە ... وە بەڵا هەر کاتێك بێت توشی هەر یەکێکمان دەبێت وە هەناسە گەر دەرچێت ڕەنگە جارێکی تر نەگەڕێتەوە ... وە هەرگێز مەغرور نەبین بە سامان و هێز و لەش ساغی و پلە و پایەوە چونکە ئەمانە هەمووی خەونن ڕەنگە لە چاو تروکانێکدا نەمێنن ...

## مامۆستایەك (شێخ) فەرمووی:-

کوڕی کابرایەکی گەورە بازرگان بانگهێشتی کردم بۆ سەردانی باوکی کە نەخۆشە ...پرسیارم لە کوڕەکە کرد لە جۆری نەخۆشییەکەی باوکی .. گوتی:- باوکم توشی نەخۆشی تلیفی جگەر بووە ... وە هەروەها چەند بەشێکی تر لە لاشەی توشی شێرپەنجە بووە ... بەڵام پزیشك پێی نەگوتووە بە نەخۆشییەکەی .. وە

(٣) (رواه البخاري، وانظر: سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٣١٤١) •

ئێمەیش ئاگادارمان نەکردبووەوە .. ئەویش هیچ دەربارەی نەخۆشییەکەی نازانێ ... چووومە ژوورەوە بۆ لای ئەو بازرگانە ... بینیم کە لەسەر جێگایەکی سپی راکشاوە تەمەنی هێشتا نەگەیشتووەتە شەست ساڵ ... هێشتا بە گوڕە و نەخۆشییەکە کاری لێ نەکردووە .. تا رادەیەك ... تەوقەی لە گەڵدا کردم و فەرمانی کردە کوڕەکانی کە بچنە دەرەوە ... کاتێ کە دەرچوون و بە تەنها ماینەوە ... ماوەیەك بێ دەنگ بوو .. ئەمجار دەستی بە گریان کرد.. رووی لێ کردم و گوتی:- ئاهـ هـ هـ هـ ... ئەی مامۆستا .. لەناوچوون بۆ ئەم دونیایە لەو کاتەوە کە خۆم ناسیوەتەوە پارە کۆ دەکەمەوە ... وە یەك یەك دەمژماردن .. خۆم دەخستە نێو هەموو جۆرە بازرگانییەکەوە ... چەند ماندوو دەبووم لەو پێناوەدا ... رێگر بوو بۆ ئەنجامدانی خواپەرستیم ... چەندەها جار نوێژی بەیانیم لە دەست دەچوو چونکە شەوان تاکو درەنگێك خۆم خەریك دەکرد بە سەروەت و سامانەکەمەوە ... و بە دواداچوونی کۆمپانیاکان ... چەند خۆم بێ ئاگا کردبوو لە خوێندنەوەی قورئان .. وە رەزیلیم دەکرد لە پارە بەخشین بەسەر هەژار و نەداراندا ..... مامۆستا گیان .. سوێند بە خوا ... هەر کاتێك ناخم پێی بگوتمایە کە بایەخ بە دینەکەت بدە و بیر لە دوارۆژی خۆت بکەرەوە ... ئەوا دەمگوت:- هێشتا کاتی ماوە .. بەڵکو ئەگەر تەمەنم گەیشتە شەست ساڵ خۆم خانەنشین دەکەم و ... کێڵگەیەك دەکرم و نیشتەجێ دەبم وئیتر خۆم یەکلا دەکەمەوە بۆ پشوودان و خواپەرستی ... تا مردن .. بەڵام بە داخەوە ئەوەتا نەخۆشی رێگەم پێ دەگرێ .. وە پرسیار دەکەم لە کوڕەکان دەربارەی نەخۆشییەکەم کەچی دەڵێن:- هیچ نییە هەندێ هەوکردنی کەمە وبەد هەرسییە..... وە من وا هەست دەکەم کە نەخۆشییەکەم وا نییە کە ئەوان باسی دەکەن .. ئەمجار دەستی بە

گریان کرد و گوتی:- ئایە ئەو کوڕانەی منت بینی کە بانگهێشتی تۆیان کرد بۆ سەردانم؟! .. ئەوان وای دەردەخەن کە بەزەییان بە مندا دێتەوە .. دوێنی لام دانیشتبوون .. منیش وام نیشان دا کە خەوتووم بۆ ئەوەی بچنە دەرەوە... کاتێ وایان زانی کە من خەوتووم دەستیان کرد بە باس کردنی بازرگانییەکانم .. وە پارەکانی منیان دەژمارد .. وە هەر یەکەیان لە میراتییەکەی من چەندیان دەکەوێت... وە چۆن بە پارەکەم خۆشگوزار دەبن ...ئەمجار دەنگیان بەرز بووەوە .... وە دەستیان کرد بە مشت و مڕ لەسەر باڵەخانەیەکی گەورەی من ... یەکەمیان گوتی:- دەیفرۆشین و پارەکەی دەکەینە نێو میراتەکەدا و بەشی دەکەین... یەکێکی تریان گوتی:- نەخێر بەڵکو دەیدەینە کرێ ... یەکێکی تریان هاواری کرد و گوتی:- بەڵکو ئەوە بەشی منە .... وە دەنگیان بەرز بووەوە ... نەفرەتیان لێ بێت ... لەسەر پارەکەم شەڕ دەکەن و هێشتا من زیندووم .. ئەمجار دەستی کرد بە گریان بۆ خۆی و ئەو ڕۆژەی کە ئێستا ئەوی تیادایە وە هەر ئەوەندە مابوو بڵێت ..

﴿مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيهْ * هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيهْ﴾ [الحاقة: ٢٨- ٢٩] .

واتە:- ئەوەتە، ئەو ماڵ و سامانەی کە بووم، فریام نەکەوت ( بەڵکو نەما و تەفر و تونا بوو ) ئەو دەسەڵاتەی کە بووم لە دەستمدا نەماو لە دەستم چوو، ﴿رَبِّ ارْجِعُونِ * لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحاً فِيمَا تَرَكْتُ ﴾ [المؤمنون: ٩٩ - ١٠٠] .

واتە:- پەروەردگارا بمگێڕەرەوە بۆ دنیا بەڵکو چاکە ئەنجام بدەم و کاری باشە بکەم و ئەو هەلانەی کە لە دەستم چووە لەمەودوا لە دەستی نەدەم .

ئەمە یەکەم ئامۆژگارییە بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت بچنە بەهەشتەوە..

## ئامۆژگاری دووەم ...

ئەوانەی ئەهلی بەهەشتن ئەگەر یەکێکیان دڵی تەنگ بێت بە هۆی موصیبەتێکەوە یان بەڵایەکەوە .. لە ناخەوە هەستی بە پێویستییەك کرد... لە نیوە شەودا هەڵدەستێت و دەستی بەرز دەکاتەوە و تکا دەکات... وە بە ترسەوە دەچێتە سوجدە .. وە داوا لە خوا دەکات بۆ هەر چاکەیەك ... وە گومانی باشی بە خوای خۆی هەیە ... وە دەزانێت کە ئەو لەبەر دەستی پادشایەکی بە دەسەڵاتدایە .. کە هەرگێز زمانەکانی لێ تێك ناچێت و هەموو زمانێك دەزانێت...وە دەنگەکانی لێ تێکەڵ نابێت ... وە بێزار نابێت بە هۆی زۆری داواکارانەوە و هەمەجۆری داواکانیان .. ئەگەر شەوگار هات بە سەردا .. وە خوداوەندەکەیان دەرگای لێ خۆش بوون بکاتەوە ... ئەوان یەکەم کەس دەبن کە لێی دەچنە ژوورەوە ... چونکە ئەوان بە راستی باوەریان بە ئایەتەکانی خوای خۆیان هێناوە ...

﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّداً وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ * تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ * فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾

[السجدة: ١٥ ١٧] .

واتە:– بە راستی تەنها ئەوانە بروا بە ئایەتەکانی ئێمە دەهێنن، کاتێك یادەوەری دەکرێن پێی، خێرا سوژدە دەبەن وتەسبیحات و سوپاسگوزاری پەروەردگاریان دەکەن، لە کاتێکدا ئەوانە بە هیچ شێوەیەك فیزیان نییە و خۆیان بە گەورە نازانن، ئەو ئیماندارە بەختەوەرانە نێوانیان خۆش نییە لەگەڵ راکشان لە جێگەو نوێنی گەرم و نەرما واتە: بە نوێژ و خواپەرستی بەشێکی شەو دەبەنە سەر،

هەمیشە نزا و پاڕانەوەیان ڕوو بە پەروەردگاریانە لە خەشم و قین و دۆزەخی دەترسن، ئاواتی ڕەزامەندی و بەهەشتیان هەیە ولەو رزق وڕۆزی وتوانایی وزانیاریەی پێمان بەخشیوون دەبەخشن، جا هیچ کەس لەو بەختەوەرانە نازانێت چی بۆ هەڵگیراوە و شاراوەتەوە لە ناز ونیعمەتی جۆراوجۆر لای پەروەردگاری، کە چاوان پێی گەش دەبنەوە و بە بینینی شاد دەبن، لە پاداشتی کار و کردەوەی چاك و پاکیاندا کە ئەنجامیان دەدا.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە شەو نوێژ و نوێژی (الوتر) کردووە ئەوەتا پێغەمبەرمان ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت:

( إن الله وتر يحب الوتر فأوتروا يا أهل القرآن)(٤) .

واتە: خوای گەورە تاکە و تاکی خۆش دەوێت کەوابوو نوێژی ویتر بکەن ئەی ئەهلی قورئان .

وە خوای گەورە فەزڵ و چاکەی شەونوێژی لە نیعمەتی دونیا و قیامەتدا کۆکردووەتەوە ..لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت:

(عليكم بقيام الليل فإنه دأب الصالحين قبلكم، وإن قيام الليل قربة إلى الله ومنهاة عن الإثم وتكفير للسيئات ومطردة للداء عن الجسد)(٥) .

سەیر لەوەدایە کەنوێژی (الوتر) لە هەموو پەرستنەکانی تر سووك و ئاسان ترە... لەگەڵ ئەوەیشدا زۆربەی خەڵکی پشت گوێی دەخەن ئەگەر هاتوو کەسێك نوێژی مەغریبی ئەنجامدا پرسیارمان لێ کرد:- ئەی فلان کەس بۆ نوێژی سوننەتی مەغریب ناکەیت؟ پرسیارمان لێ دەکات:- سوننەتی مەغریب چەند ڕکاتە؟ بە

(٤) (رواه الترمذي وأصله في الصحيحين، وصححه الشيخ الألباني في صحيح الترمذي: ٤٥٣).

(٥) (رواه الترمذي، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح الجامع الصغير: ٤٠٧٩).

ئەومان گوت:- دوو رکاتە .. ئەو دەڵێت:- من تەنها یەك رکات دەکەم .. پێی دەڵێین:- نابێت ... ئەبێ دوو رکات بکەیت یاخود مەیکە ..وە هەروەها نوێژی چێشتەنگاو (الضحی) و سوننەتی نوێژی بەیانی و سوننەتی نوێژی عیشا و نوێژی (الإستحارة) بە لای کەمەوە دوو رکەعاتە ..بەڵام نوێژی (الوتر) باشترین (نوافل)ە لەگەڵ ئەوەیشدا خوای گەورە لەسەر خەڵکی سووك کردووەتەوە ودەتوانیت یەك رکات بکەیت ... بیکە ئەگەر تەنها یەك رکاتیش بێت و سورەتی {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}ی تیادا بخوێنە کە بە هەمووی دوو خولەك لە کاتەکەت دەگرێت .. بەڵێ تەنها یەك رکات بکە لە لای خوای گەورە بەو کەسانە دەژمێردرێیت کە بۆ شەو نوێژ هەستاون ...ئەگەر خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا ناوی ئەو کەسانە بهێنێ کە لەو شەوەدا شەو نوێژیان کردووە ناوی خۆت دەبینیت کەچی تۆ تەنها یەك رکات نوێژت کردووە ...ئەی چۆنە ئەگەر زیادی بکەیت و کردت بە سێ رکات؟... یان پێنج؟ .. یان حەوت؟ ... ئەمە باشترە وە هەر کەس زیادی بکات ئەوا لای خوای گەورەیش زیاد دەبێت ... وە مەرج نییە لە پێش شەبەق ئەو نوێژە ئەنجام بدەیت ...بەڵکو لە پاش نوێژی عیشا ئەنجامی بدە یا خود لە پێش خەوتن ... وە دڵی تەنگ ببوایە ئەوا دەستی بە نوێژ دەکرد ... وە ﷺئەگەر پێغەمبەری خوا دەیفەرموو:-

(یا بلال أقم الصلاة أرحنا بها)[٦].

واتە: بە نوێژ ئارامیمان پێ ببەخشە ئەی بیلال...

وە خۆشەویست دەفەرموێ ﷺ:- (جعلت قرة عيني في الصلاة)[٧].

---

(٦) (صحيح سنن أبي داود: ٤٩٨٥).

(٧) ( صحيح الجامع الصغير: ٣٠٩٨).

واتە: نوێژ بیلبیلەی چاوی منە .. وە پیاو چاكان لەگەڵ نوێژدا كاری سەیریان بووە...(أبو صالح) كە خوشكەزای (مالكی كوڕی دینار) ە دەڵێت:- ئەگەر شەو بهاتایە بەسەر خاڵۆمدا( مالكی كوڕی دینار)...دەچووە ژوورێكەوە لە ماڵەكەی خۆی و دەرگای دادەخست وە دەرنەدەچووە دەرەوە تاكو شەبەق.... شەوێكیان لە پێش ئەو چوومە ژوورەكەیەوە و لە سوچێكدا خۆم شاردەوە ...خاڵۆم هاتە ژوورەوە و بەرماڵەكەی راخست ...ئەمجار لەسەر بەرماڵەكە راوەستا و پێی جووت كرد وكاتێ ویستی دەست بەرز بكاتەوە بۆ (الله أكبر) گریان زاڵ بوو بە سەریدا و دەستی بە گریان كرد... ئەمجار گریا و دەستی بە (أستغفر الله) كرد و تكای دەكرد ... پاشان بە دەستەكانی ریشی خۆی گرد و گوتی:- (خودایە... ئەگەر پێشینەكان و پاشینەكانت كۆ كردەوە ئەوا پیرییەكەی مالك بپارێزە لە ئاگر )... ئەمجار ئەو رستەی دووبارە دەكردەوە و دەگریا... وە بزانە ...زۆر نوێژ كردن و زۆر سوجدە بردن بۆ خوای پەروەردگار هۆكارن بۆ چوونە ناو بەهەشتەوە...لە رەبیعەی كوڕی كەعبەوە ﷺ دەڵێت:- كنت أبيت مع رسول الله ﷺ آتيه بوضوئه وبحاجته فقال: (سلني) فقلت: مرافقتك في الجنة، قال: (أو غير ذلك) قلت: هو ذاك، قال: (فأعني على نفسك بكثرة السجود)[٨] .

واتە: شەوانە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەمامەوە .. ئاوی دەست نوێژ و پێویستییەكەم بۆ دابین دەكرد ... پێی گوتم:- داوا بكە ... گوتم:- داوات لێ دەكەم كە لە بەهەشتدا بمكەیتە هاوڕێی خۆت ... گوتی:- جگە لەوە داوا بكە، گوتم: نەخێر ئەوە داوامە ... فەرمووی:- كەواتە سوجدە زۆر ببە ...

وە لەو جۆرە نوێژانە (نوێژە سوننەتەكان) خۆشەویست دەفەرموێ ﷺ:-

(٨) (صحيح سنن أبي داود، ١٣٢٠).

(من ثابر على اثنتي عشرة ركعة من السنة بنى الله له بيتا في الجنة أربع ركعات قبل الظهر وركعتين بعده وركعتين بعد المغرب وركعتين بعد العشاء وركعتين قبل الفجر)[٣] .

هەرکەسێ لە شەو ڕۆژێکدا دوازدە ڕکەعات نوێژی کرد ئەوا خوای گەورە لە بەهەشتدا خانوویەکی بۆ دروست دەکات ... چوار لە پێش نیوەڕۆ و دووان لە پاشی .. وە دوو ڕکات لە پاش مەغریب .. وە دوو ڕکات لە پاش عیشا و دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی.

## ئامۆژگاری سێیەم:–

گەورەترین ڕەوشتێك لە ڕەوشتەکانی ئەهلی بەهەشت ئەوەیە کە کاری سەرەکی هەر یەکێکیان لەم ژیانە پەرستنی خوایە .. وە بانگەواز کردنە بۆی ... وە کار کردنە لە پێناو ئەم دینەدا .. وە ئامۆژگاری خەڵکییە .. وە فەرمان کردنە بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە ... بە ڕاستی هەندێ خەڵك هەیە ئەگەر دەربارەی بانگەواز کردن بۆ دینی خوا ببیسێ وا دەزانێ بانگەواز تایبەتە بەو کەسانەی کە ڕیشی درێژ کردووە و شەواڵی کورت کردووەتەوە ...ئەمجار پێت دەڵێت:– من ڕیشم دەتاشم و جل و بەرگەکەم درێژ دەکەم و جگەرە دەکێشم ... ئەم کردەوانەی کردووەتە بەربەستێك لە نێوان خۆی و بانگەوازکردن بۆ دینی خوا و ئامۆژگاری خەڵکی ... وە بێ گومان ئەمە هەڵەیەو وەسوەسەی شەیتانە ... بەڵێ .. نکۆڵی لەوە ناکەم کە بانگەوازکار دەبێت خۆی لە سەر ڕێگە ڕاستەکە بێت و ئەوەی بە خەڵکی دەڵێت خۆی جێ بە جێی بکات .. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە موسڵمان واز لە گوێڕایەڵێکان بهێنێ بە هۆی کەوتنە ناو هەندێ سەرپێچییەوە .. چونکە ڕەنگە

---

(٣) ( صحيح الجامع الصغير: ١٠٤٦٥).

ئەو سەرپێچییە کەمە لە ناو دەریای چاکەکاندا بزر بێت ... بەڵکو رەنگە هەندێ جار خەڵکێکی موسڵمان کە هەندێ تاوانی هەیە بگاتە لای هەندێ کەس و جێگە کە بانگەوازکارێکی تەواو پێی نەگات...هەرچەندە تۆ کەمتەرخەمی لە ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوادا بەڵام تۆ دەتوانیت ئەوانەی کە وازیان لە نوێژکردن هێناوە بانگەوازیان بکەی بۆ ئەنجامدانی نوێژەکانیان...چونکە وازهێنان لە نوێژ کوفرە...تۆ دەتوانیت ئەو کەسانە ئامۆژگاری بکەی کە دەکەونە نێو خراپەکارییەوە بۆ ئەوەی تەوبە بکەن .. یا خود ئامۆژگاری ئەو کەسانە بکەی کە رێگە بە ناموسی خەڵکی دەگرن واز لەو بەدڕەوشتییە بهێنن ...بەڵکو رەنگە بانگەوازکارێکی تەواو لەگەڵ خەڵکانێکدا دادەنیشێت کەچی نازانێت ئەوانە ریبا دەخۆن..یان دەکەونە نێو خراپەکارییەوە یان وازیان لە نوێژ هێناوە .. چونکە ئەوان خۆیان بە کەسانێکی باش دەردەخەن لە پێش چاوی پیاوچاکاندا ... بەڵکو ئەگەر کەسێکی وەکو خۆیان ببینن ئەوا خۆیان ناگۆڕن لە پێش چاوی ئەواندا .. وە هەموو نهێنییەکانیان بۆ دەخەنە ڕوو.. وە کارەکانی خۆیان لا ئاشکرا دەکەن.. ئەی باشە تۆ چۆن ئەوان ئامۆژگاری دەکەیت و بانگەوازیان دەکەیت ..؟ بێگومان ئەمەیش شێوازی خۆی هەیە ... وەکو پێشکەش کردنی کاسێتی سوود بەخش.. وە بانگەواز کردنی پیاو چاکان بۆ مەجلیسەکانی خۆتان ... وە هەندێ جار ئامۆژگاری بە تاك ... وە چەندەها شێوازی تر ... وە هەرگیز مەڵێ خۆم پەیوەست نیم بە دینەوە ئیتر چۆن بانگەواز بکەم و ئامۆژگاری خەڵك بکەم ... باش بزانە کە کاری بانگەوازکردن بۆ لای خوا کارێکی خوایی بەربڵاوە .. شێوازی جۆراو جۆری هەیە کە پێویستی بە کارکەرە ... وە هەموومان بەش بە حاڵی خۆمان هەڵەمان هەیە ... وە هەموو ئادەمیزادێك هەڵەی هەیە ..

ولو لم يعظ في الناس من هو مذنب      فمن يعظ المذنبين بعد محمد ﷺ؟!

واته:-

ئەگەر کەسی تاوانبار لە نێو خەڵکیدا ئامۆژگاری نەکەن
ئەی لە پاش (محمد) ﷺ کێ ئامۆژگاری تاوانباران بکات؟!

**مامۆستایەك پێی گوتم:-**

رۆژێك لە مزگەوت دەرچووم گەنجێك هات بۆ لام کە شوێنەواری تاوانی پێوە دیار بوو ... لێوەکانی بە هۆی زۆری جگەرە کێشانەوە رەش ببوو ... سەرسام بووم کاتێ بینیم ... ئاخۆ چی دەوێت کاتێ سڵاوی لێ کردم گوتی:- مامۆستا ئێوە پارە کۆ دەکەنەوە بۆ دروست کردنی مزگەوت ..وا نییە؟؟ گوتم:- بەڵێ ... بۆیە ئەویش کیسەیەکی بەستراوی پێدام گوتی:- ئەم پارەیە لە دایك و باوك و خوشك وبرا و خزمەکانم کۆم کردووەتەوە .. ئەمجار رۆیشت ..کاتێ کە کیسەکەم کردەوە بینیم پێنج هەزار ریالی تێدایە وە ئەو پارەیە لە دروست کردنی مزگەوتەکەدا بە کارمان هێنا .. ئەمرۆ لەو مزگەوتەدا هەر یادێکی خوا بکرێت یان هەر قورئانێکی تیادا بخوێنرێت وە هەر کەسێك نوێژی تیادا بکات ئەوا لە تەرازووی ئەو گەنجەدا وەکو پاداشتی ئەوانی هەیە .. بۆیە موژدە بۆ خۆی .. بەڵام ئەگەر ئەو گەنجە شەیتان بیخەڵەتێنی و بیگوتایە .. من هێشتا تاوانبارم ... هەر کاتێك تەوبەم کرد ئەو کاتە دەست دەکەم بە کاری چاکە و خزمەتی دینی خوا دەکەم و مزگەوت دروست دەکەم .. ئەوا چاکەیەکی زۆری لە دەست دەردەچوو ... پێغەمبەری خوا دەفەرموێ ﷺ: (من دعا إلى الهدى كان له من الأجر مثل أجور من تبعه لا ينقص ذلك من أجورهم شيئاً)[١٠].

(١٠) (صحيح جامع الصغير: ٦٢٣٤).

وە دوو گەنج دەناسم کە چەند ساڵێکە کەمتەرخەمن ..ئەگەر مانگی ڕەمەزان یان کاتی حەج بێت ئەوا سواری ئۆتۆمبیلەکەیان دەبن و هەموو کەرەستەیەکی چاك کردنی ئۆتۆمبیل و کارەبایی لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن بەرەو شاری مەککە بەڕێ دەکەون ... وە بەسەر هەر جێگای ئاوخواردنەوە و ئاودەست و ئۆتۆمبیلی پەککەوتە کە لە ڕێگای حاجییان دایە چاکی دەکەنەوە ... لە پێناو خزمەتکردنی برا موسڵمانەکانیان ... وە هیچ کەسێك بە کارەکەیان نازانێ تەنها خوا نەبێت ....

یەکێك لە بانگەواز کاران دەڵێت:- لە شەوێکی درەنگ وەختدا درا لە دەرگا.. مامۆستاکە دەڵێت:- بە ترسەوە چوومە دەرەوە ... گەنجێکم بینی بە جل و بەرگ و ڕوویدا شوێنەواری تاوان و سەرپێچی دیارە .. پرسیارم لێ کرد:- چیت دەوێ؟ گوتی:- ئەوە لە ئۆتۆمبیلەکەمدا دوو کرێکاری (هندی)م لەگەڵدایە..لەسەر دەستی من بوونەتە موسڵمان وە ئێستا هێناومن بۆ ئەوەی شایەتمانیان پێ بهێنی و وەڵامی پرسیارەکانیان بدەیتەوە ... مامۆستاکە دەڵێت:- سەرسام بووم و گوتم:- چۆن بانگەوازیانت کرد؟ گوتی:- ماوەیەك کاسێت و کتێبیان پێ دەدەم تاکو موسڵمان بوون ..

یەکێك لە کرێکارانی یەکێك لە نوسینگەکانی بانگەواز و ئامۆژگاری (مکتب الدعوة والإرشاد) بۆی باس کردم و گوتی:- گەنجێکی جگەرە کێش کە لە نێو تاوانێکی زۆردا بوو .. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر مانگی ڕەمەزان بهاتبایە.. لە بازرگانەکان پارەیەکی زۆری کۆ دەکردەوە ئەمجار بەو پارەیە هەزاران کاسێتی دەکڕی و دەیبرد بۆ ئەو نوسینگانە بە مەبەستی دابەش کردنی لە کاتی چالاکییەکانیاندا لە مانگی ڕەمەزاندا .... چەندەها جار کرێکارانی ئەو نوسینگانە (مکاتب الدعوة والإرشاد) شکایەتی کەمی هاوکارانیان دەکەن .. یەکێکیان سوێندی بۆ خواردم:-

چەندەها کرێکاری بێ باوەڕ هەن کە هیچ ڕێگرێك لە نێوان ئەو و بوون بە موسڵمانیدا نییە تەنها ئەوە نەبێت کە یەکێك بۆ ماوەی هەفتەیەك یان دوو هەفتە یەکلا بێتەوە بۆی .. کاتێك دەیهێنین بۆ نوسینگەکەمان بە مەبەستی گوێ گرتن لە دەرس و ئامۆژگاری کەچی نوسینگە کەسی ئەوتۆ نابینێتەوە کە هاوکارییان بکات ... بەڵکو .. چەندەها کچی خزمەتکاری بێ باوەڕ هاوەڵانی چالاکانە لەگەڵیدا نەجوڵاونەتەوە لە بانگەواز کردنی بۆ ئیسلام یا خود هەرگیز کتێبێك یان کاسێتێکیان بە دیاری پێ نەداوە دەربارەی ئیسلام ... ئەویش لەسەر بێ باوەری خۆی ماوەتەوە ... یا خود چەندەها گەنج مردن یەخەی پێ گرتن و لە کاتێکدا وازیان لە نوێژ هێنا بوو یان بەردەوام بوون لەسەر تاوانێکی گەورە لە تاوانە گەورەکان ... لەبەر ئەوەی بانگەوازکاران نەیان توانیوە پێی بگەن .. یاخود هاوەڵانی بە چالاکانە ئامۆژگارییان نەکردووە .... وە چەندەها کچ هاوەڵانی خۆی لە قوتابخانەدا دەبینێ .. کە وێنە و کاسێتی حەرام لە نێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕ دەکەنەوە .. بەڵکو ژمارە تەلەفونی گومان لێکراو .. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر داوایان لێ بکەین کە ئامۆژگارییان بکەن... دەڵێت:– هێشتا خۆم پێویستم بە کەسێکە ئامۆژگاریم بکات .. من کەمتەرخەمم .. ئەگەر خۆم بە جوانی دەستم بە دینەوە گرت ئەوکاتە ئامۆژگارییان دەکەم .. سەیرە ...!! شەیتان چەند دڵخۆش دەبێت بە بیستنی ئەم وتانە .. ئایە ئیسلام چۆن گەیشتە ئەفریقیا و هیند و چین!! تاکو گەیشتە ئەوەی کە تەنها لە وڵاتی هیند دا سەد ملیۆن موسڵمان هەبێت!! وە لە وڵاتی چین دا نزیکەی ئەو ژمارەیە .. کێ بانگەوازی ئەوانی کرد؟؟ ئەوانەی کە بانگەوازی ئەوانی کرد کەسانێك بوون لە نێو ئەم خەڵکەدا .. قوتابی زانست و زانیاری نەبوون ... وە پێشەوای مزگەوتەکان نەبوون ... وە

دەرچووی کۆلێژی شەریعە نەبوون .. کەسانێك بوون کە بۆ بازرگانی کردن ڕۆیشتبوون .. ئەمجار لەوێ بانگەوازی خەڵکیان کرد و لەسەر دەستی ئەوان بوونە موسڵمان .. وە لە نێو ئەو خەڵکەی ئەفریقیا و هیند و چین دا چەندەها زانا و بانگەوازکار هەڵکەوتن .. وە پاداشتی هیدایەت دانی ئەوان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بازرگانانە .. چەند جار پرسیارم کردووە لەو کرێکارە بێ باوەڕانە کە لە وێستگەکانی بەنزیندا کار دەکەن بە یەکێکیان دەڵێم:- تۆ ماوەی چەندە لەم وڵاتەدا دەژیت؟ دەڵێت:- بۆ ماوەی پێنج ساڵە .. یان حەوت ساڵە .. منیش دەڵێم:- ئایە هیچ کەسێك کتێبێك یان کاسێتێکی پێت داوە دەربارەی ئیسلام لەو ڕۆژەوە هاتووی بۆ ئێرە؟ دڵم دەگوشێت لە کاتێکدا وڵامم دەداتەوە و دەڵێت:- نەخێر ... هەموو خەڵکی دێن و ئۆتۆمبیلەکەیان پڕ لە سوتەمەنی دەکەن و دەڕۆن.. براکەم ... ڕەنگە تۆ کەسێکی کەمتەرخەم بیت ... بەڵکو ڕەنگە هەندێ جار گوێبیستی گۆرانی بیت ... وە ڕەنگە جگەرە بکێشی .. وە ڕەنگە هەندێ جار سەرپێچی فەرمانەکانی خوا بکەیت .. بەڵام .. تۆ موسڵمانێت لە سەرەتا و لە کۆتاییدا ... وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:-

(بلغوا عني ولو بآية)[11]. ئایە تۆ تەنها یەك ئایەتت لەبەر نەکردووە بۆ ئەوەی بیگەیەنی؟ ئەوەیش دەبێت لە زۆر ڕێگاوە .. دابەشکردنی کاسێت.. بڵاو کردنەوەی کتێب ... دابەشکردنی کارتی ویردەکان (زیکرەکان) چەندەها کار کە پێویستی بە زانیاری نییە .. کێ لە ئێمە ئەگەر ڕۆیشت بۆ سەفەرێك لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵە کاسێتێکی سوود بەخش لەگەڵ خۆیدا دەبات و ئەگەر لای وێستگەیەکی سوتەمەنی وەستا ئەوا هەندێکی لەوێ بە جێ دەهێڵێ ... وە هەندێکیان لە

---

(١١) (صحيح الجامع الصغير: ٢٨٣٧).

مزگـەوتى وێـستگەكە دانێـت .. يـان دابەشـى بكاتــە سـەر ئـەو ئۆتۆمبيلانـەى راوەستاون .. خەڵكى لـە رێگاوبانـدا دەبـێ گوێبيـستى شـتێك بـن كەواتـە تـۆ ببـە پشتيوانى ئەوان بۆ گوێبيستى چاكە و يادى خوا .. كـێ لـە ئێمە ئەگـەر كتێبێكى سوود بەخشى بينى ئەوا كۆمـەڵێكى لـێ دەكرێ و پاشـان لـە مزگەتەكـەى نزيكى خۆيدا دابەشى دەكات.. يان بە ديارى دەيداتە ئەو هاوەڵانەى كە لە كار كردنـدا لـە گەڵيدان..يان قوتابييەكانى لە قوتابخانە.. وە من بـەم قـسانەم رێگـا خـۆش ناكـەم بۆ تاوان كردن يان بۆ خـاوەن تاوانـەكان بيانويـەك بهێنمـەوە .. بـەلام.. ﴿ ياديـان بخەرەوە ئەگەر يادخستنەوە سوودى هەبوو﴾ .. وە نابێت تاوان ببێتە بەربەستێك لە نێوان خاوەنەكەى و خزمەتكردنى ئـەم دينـەدا ... (أبـو محجـن الثقفـي) رضي الله عنه كابرايەكى موسڵمان بوو تووشى بەلايەك هاتبوو ئەويش خواردنـەوەى مـەى بـوو .. چـەندەها جـار سـزا درا بـوو ديـسان دەگەڕايـەوە سـەر تاوانەكـە ... سزا دەدرا و ديـسان دەگەڕايـەوە .. بـەڵكو لەبـەر زۆر تامـەزرۆ بـوونى بـە مەيـەوە ئامۆژگـارى كورەكەى خۆى كردبوو ... دەيگوت:-

إذا مت فأدفني إلى جنب كرمة | تروي عظامي بعد موتيَ عروقها
ولا تدفنـــي في الفـــلاة فإنني | أخاف إذا ما مت أن لا أذوقها

كاتێ كـە موسـڵمانان خۆيـان ئامـادە كردبـوو بـۆ دەرچـوون بـە مەبەسـتى جـەنگى فارسەكان لـە جـەنگى (القادسيە) (أبـو محجـن) يـش لـە گەڵيانـدا دەرچـوو ... وە خواردن و كەرەستەكەى لەگەڵ خۆيـدا هـەڵگرتبوو ... وە لـە بـيرى نەچـوو لەگـەڵ خۆيدا مەى ببات .. لە نێو كەرەستەكانى خۆيـدا شـاردبوويەوە .. كـاتێ گەيـشتنە قادسيە .. (رۆستم) داواى كرد كـە لەگـەڵ (سـعدى كـورى ابـى وقـاص) رضي الله عنه دا كـە سـەركردەى موسـڵمانان بـوو رووبـەڕوو ببێتـەوە .. وە نامـە گۆڕينـەوە لـە نێـوان

هەردوو لەشكرەكەدا كرا ... لەو كاتەدا شەیتان وەسوەسەی بۆ (ابو محجن) ﷺكرد لە جێگایەكدا خۆی شاردەوە و دەستی بە مەی خواردنەوە كرد .. كاتێ كە سعد ﷺ بەوەی زانی پەست بوو لێی .. وە رازی نەبوو كە بەشداری بكات لە جەنگەكە ... ئەمجار فەرمانی كرد كە بە زنجیرێك توند ببەسترێتەوە .. وە لە خەیمەیەكدا بەند كرا ... كاتێ كە جەنگ دەستی پێ كرد و ابو محجن ﷺ گوێی لە حیلەی ئەسپەكان و هاواری پاڵەوانان بوو خۆی پێ ڕانەگیرا لەو كۆت و زنجیرەدا بمێنێتەوە... وە تامەزرۆی شەهید بوون بوو بەڵكو تامەزرۆی خزمەت كردنی ئەم دینە بوو .. وە فیداكردنی گیانی خۆی بۆ خوای پەروەردگار ... بەڵێ.. هەرچەندە سەرپێچی فەرمانەكانی خوای كردووە... هەرچەندە بەردەوام بووە لەسەر مەی خواردن ... بەڵام ئەو موسڵمانە و خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ خۆش دەوێت .. ئەمجار زۆر پەشیمان بووەوەو تەماشای حاڵی خۆی دەكرد و لەبەر خۆیەوە دەیگوت:-

كفى حزناً أن ترجم الخيل بالقنى    وأترك مشدوداً على وثاقيا
إذا قمت عناني الحـــديد وغلقت    مصاريع من دوني تصم المناديا
وقد كنت ذا مال كثـــير وإخوة    وقد تركوني مفرداً لا أخا ليا
فلله عـــهد لا أحـــيف بعهده    لإن فرجت ألا أزور الحوانيا

خێزانەكەی (سعد)ﷺ گوتی:- چیت دەوێ؟ ئەویش گوتی:- ئەم كۆت و زنجیرەی پێم بكەرەوە و ئەسپەكەی (سعد)ﷺ كە ناوی (البلقـاء) ە پێم بدە بۆ ئەوەی بجەنگم ئەگەر خوای گەورە شەهیدی بە قسمەت كردم ئەوا مەبەستمە و ئەگەر نەكوژرام ئەوا پەیمان بێت دەبێ بگەڕێمەوە بۆ لات و بە كۆت و زنجیرەكە دیسان بمبەسەرەوە ... ئەمجار دەستی كرد بە تكا كردن تاكو رازی بوو وە

كۆتەكەی لە پێی كردەوە و (البلقاء) ی پێدا ئەویش قەڵغانەكەی پۆشی وە دەموچاوی خۆی داپۆشی ... ئەمجار وەكو شێر بازی دایە سەر ئەسپەكە و بەرەو بێ باوەڕان ڕۆیشت .. پارێزگاری لەم دینە دەكرد و بەرگری لێ دەكرد خۆی پەیوەست كردە دواڕۆژەوە و شەیتان سەرنەكەوت لە هەڵخەڵەتانیدا بۆ سستی نواندن لە خزمەت كردنی ئەم دینەدا ...خۆی خستە نێو بێ باوەڕانەوە بە هەموو هێزی لە ئەوانی دەدا بە تیر و شیرەكەی .. خەڵكی لێی سەرسام بوون و نەیاندەناسی و لەو ڕۆژەدا نەیانبینی بوو .. (أبو محجن)ﷺ بەردەوام بوو لە كوشتاری بێ باوەڕان ... بەردەوام گیانی خۆی زۆر بێ نرخ دانابوو لە پێناوی خوادا .. بەڵێ .. (أبو محجن) ﷺ بەردەوام بوو ... بەڵام سعدی كوڕی ئەبی وەقاصﷺ پێی لە چەند جێگەیەكەوە برینداربوو بۆیە نەیتوانی دابەزێتە گۆڕەپانی جەنگەكە.. وە لە دوورەوە چاودێری جەنگەكەی دەكرد ... كاتێ كە (أبو محجن) یﷺ بینی سەرسام بوو لە هێز و توانا و كوشتاری ... گوتی:- لێدانەكەی وەكو لێدانەكەی (أبو محجن) ەﷺ و هێرش بەردنی ئەسپەكەی وەكو هێرش بردنی (البلقاء) .. بەڵام .. (أبو محجن) لە كۆت و زنجیردایە .. و (البلقاء) بەستراوەتەوە ... !! كاتێ كە لە جەنگەكە بوونەوە (أبو محجن) ﷺ گەڕایەوە بۆ بەندكردنەكەی خۆی .. وە پێیەكانی خۆی بە كۆت و زنجیر بەست .. كاتێ كە سعدﷺ گەڕایەوە بینی ئەسپەكەی ماندوو دیارە و ئارەقە دەكات ... گوتی:- ئەمە چییە؟ بۆیە چیرۆكەكەی (أبو محجن) ﷺ یان بۆ گێڕایەوە ئەویش ڕازی بوو بە كردەوەكەی و ئازادی كرد و گوتی:- سوێند بە خوا دەبێ چیتر لێت نەدەم بە هۆی مەی خواردنەوە .. ئەویش گوتی:- سوێند بە خوا دەبێ منیش چیتر مەی

نەخۆمەوە .. بە راستی ئەو شیرەی کە دراوەتـە (ابـو محجـن)ﷺ شـیرێکی پـاك و بێ گەردە[١٢] ..

## ئامۆژگاری چوارەم ...

ابن کثیر لە کتێبی (تاریخ)دا دەگێڕێتەوە و دەڵێت:- کابرایـەکی موسـڵمان هـەبوو زۆر بێ کەس و بێ هێـز و لاواز بـوو .. پارەیـەکی زۆری لای یـەکێك لـە ئـەمیرەکان بوو.. ئەویش هاورد و بردی پـێ دەکـرد و مافەکـەی خـۆی پـێ نـەدەدا .. وە هـەر کاتێـك داوای مافەکـەی خـۆی بکردایـە ئـەوا ئـازاری دەدا .. وە فـەرمانی دەکـردە خزمەت کارەکانی کە ئەشکەنجەی بدەن .. بۆیە رۆیـشت بـۆ لای سـەرکردەیەك لـە سەرکردەی سەربازەکان ... کەچی ئەو توند تـر و کەللـە رەقـتر بـوو .. ئـەم کـابرا هەژارە دەڵێت:- کاتێ ئەوەم بینی.. بێ ئومێد بـووم لـە پارەکـەم و خـەمێکی زۆر دایگرتم ... رۆژێك من لـەو بـیر و هۆشـەدا بـووم و نەمـدەزانی لای کـێ شـکاتی لـێ بکەم .. کابرایەك پێی گـوتم:- بـڕۆ بـۆ لای ئـەو کـابرا بـەرگ دوورە کـە پێشەوای مزگەوتە ..منیش گوتم:- ئایە بەرگ دوورێك چی دەتوانێت بکات بـەم ستەمکارە؟ لە کاتێکدا کە پیاوانی دەوڵەت نـەیانتوانی هـیچ بکـەن .. گـوتی:- ئـەو لـەو بـەرگ دوورە زۆر دەترسێ .. لە هەموو ئەوانەی کە شکایەتت لایان کـردووە زیاتر .. بـڕۆ بۆ لای بەڵکو دەرگایەکت لێ کرایـەوە .. گـوتی:- رۆیـشتم بـۆ لای هەرچـەندە زۆر ئومێدم پێی نەبوو ..چیرۆکەکەم بۆی گێڕایەوە و باسی ئەوەم کرد کە چەند هـەوڵم داوە، کەچی ئـەو سـتەمکارە ئـازارم دەدات .. ئـەویش هەسـتا و دوکانـەکی خـۆی داخست و پێکەوە رۆیشتین تاکو گەیشتینە ماڵ کـابرای سـتەمکار و لـە دەرگامـان دا.. کابرا بـە تووڕەییـەوە دەرگاکـەی کـردەوە .. کـاتێ کـە کـابرای بـەرگ دووری

(١٢) (اسناد قصة أبي محجن صحيح كما ذكره ابن حجر في الإصابة: ج٤. قسم الكنى).

بینی.. زۆر ترسا و ڕێزی لێ گرت و بایەخی پێدا ... کابرای بەرگ دوور گوتی:- ماڤ ئەم کابرا لاوازە بدەرەوە .. کابرا گوتی:- ئەو هیچ پارەیەکی لام نییە و ئینکاری کرد .. کابرای بەرگ دوور هاواری بە سەردا کرد و گوتی:- پارەی ئەم کابرا لاوازە بدەرەوە ئەگینا بانگ دەدەم ... !! کابرا ڕەنگی تێکچوو وە هەموو پارەکەی بە تەواوی دامەوە ... ئەمجار ئێمەیش هەستاین وگەڕاینەوە ... لە کاتێکدا من زۆر سەرسام بووم لەم کابرای بەرگ دوورە لەگەڵ ئەوەیشدا حاڵی باش نەبوو .. وە لاشەیەکی لاوازی هەبوو .. چۆن ئەو کابرای ستەمکارە ملکەچی قسەکانی بوو ..؟ منیش هەندێ پارەم پێی دا کەچی پێی ڕازی نەبوو .. گوتی:- ئەگەر بمویستایە ئەوا ئێستا هێندە پارەم هەبوو کە لە ژماردن نەدەهات ... ئەمجار پرسیارم لێ کرد کە باسی خۆی بکات و منیش باسی سەرسامی خۆمم بۆی کرد .. کەچی گوێی پی نەدام .. بۆیە منیش سوور بووم لەسەر داواکەم .. گوتم:- بۆ بە بانگدان هەڕەشەت لێ کرد؟ گوتی:- تۆ ئێستا پارەی خۆتت وەرگرتووە و داوات لێ دەکەم بڕۆ .. گوتم:- سوێند بە خوا دەبێ بۆم بگێڕیتەوە .. گوتی:- هۆی ئەوە، ئەوە بوو کە لە پێش چەند ساڵێك ئەمیرێکی تورکی دراوسێمان بوو یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی دەوڵەت و گەنجێکی روو جوان بوو .. ڕۆژێك ئافرەتێکی جوان لە حەمام دەرچوو بوو وە کراسێکی بەرزی بە نرخی لە بەردا بوو.. ئەویش سەرخۆش بوو هەستا و خۆی پەیوەست کرد بە ئەوەوە و دەیویست لە گەڵیدا بچێتە ژوورەوە ... ئەویش ڕازی نەبوو وە دەستی بە هاوار کرد بە دەنگێکی بەرزەوە دەیگوت:- من ئافرەتێکی خاوەن مێردم ...وە ئەم پیاوە نیازی خراپە و دەیەوێ لە گەڵیدا بڕۆمە ژوورەوە .. وە مێردەکەم سوێندی بە تەڵاق خواردووە کە دەبێ هیچ شەوێك لە هیچ ماڵێك نەمێنمەوە وە ئەگەر هەرکاتێك لێرە

بمێنمەوە ئەوا تەلاقی دەکەوێ .. وە ئابڕووم دەچێت و توشی شەرمەزاری دەبم .. کە هەرگیز ڕۆژگار لە بیری ناچێتەوە ... بەرگ دوورەکە گوتی:- بۆیە منیش هەستام و چووم بۆ لای و ئینکاریم لێ کرد و ویستم ئافرەتەکەی لە دەست رزگار بکەم بۆیە بە چەقۆیەك کە لە دەستی بوو لە سەری دام و خوێن بە بالآمدا هاتە خوارەوە ... وە زاڵبوو بەسەر ئافرەتەکەدا و بە زۆر بردییە ژوورەوە ... منیش گەڕامەوە و خوێنەکەم شووشت و سەرم پێچا ... وە هاوارم بۆ خەڵکی کرد و گوتم:- ئەم پیاوە کە ئەوەی دەزانن ئەو کردی و بۆیە هەستن لە گەڵمدا و ئینکاری لێ بکەین و ئەو ئافرەتە رزگار بکەین ... خەڵکی لە گەڵمدا هەستا و هێرشمان بردە سەر ماڵەکەی و ئەمجار کۆمەڵێك لە خزمەتکارەکانی هەستان و بەرەو لای ئێمە هاتن و دار و چەقۆ بە دەستیانەوە بوو .. دەستیان کردە لێدانی خەڵکی ... وە خۆی بەرەو لای من هات و بە توندی لە سەری دام و تاکو خوێناوی کردم .. بۆیە ئێمەیش لە ماڵەکە دەرچووین بە زەلیلی و دڵ شکاوی .. منیش گەڕامەوە ماڵی خۆم و لە کاتێکدا لەبەر زۆری ئازار و خوێن ڕێگای ماڵی خۆمم بزر کردبوو ... لەسەر جێگەم ویستم بنووم .. بەڵام خەوم لێ نەکەوت ... وە سەرسام بووم و نەمدەزانی چی بکەم بۆ رزگار کردنی ئەو ئافرەتە ئەمشەو لە دەستی دەری بهێنم و بگەڕێتەوە ماڵەکەی خۆی بۆ ئەوەی تەلاقی نەکەوێ ... بۆیە لە دڵی دام کە بانگی بەیانی بدەم بۆ ئەوەی وا بزانێت کە ڕۆژ بووەتەوە و ئەویش لە ماڵەکەی دەری بکات و ئەویش بڕوات بۆ لای مێردەکەی .... وە منیش سەرکەوتمە سەر منارەکە و دەستم بە بانگدان کرد و بەدەنگێکی بەرز ... وە ئەمجار تەماشای دەرگای ئەوانم دەکرد بۆ ئەوەی بزانم ئافرەتەکە لە ماڵ دەرچووە یان نا .. بانگەکەم تەواو کرد و کەچی دەرنەچوو .. ئەمجار سوور بووم

لەسەر ئەوەی کە قامەت ببەستم بۆ نوێژی بەیانی بۆ ئەوەی ئەو کابرا پیسە وا بزانێ کە رۆژ بووەتەوە ... لەو کاتەی کە من تەماشام دەکرد بۆ ئەوەی بزانم ئافرەتەکە دەردەچێت یان نا .. بینیم رێگاکە پڕ بوو لە سەرباز و سواری دەوڵەت... ئەوانیش دەڵێن:- ئەوا کێ بوو لەم کاتەدا بانگی دا؟ وە تەماشای منارەی مزگەوتەکەیان دەکرد .. منیش هاوارم کرد:- ئەوە من بووم بانگم دا .. من دەمویست یارمەتیم بدەن .. گوتیان:- دابەزە .. منیش دابەزیم ... گوتیان:- وەڵامی خەلیفە بدەرەوە ... منیش زۆر ترسام... سوێندیانم دا بە خوای گەورە بۆ ئەوەی گوێبستی چیرۆکەکەم بن کەچی رازی نەبوون ... وە پێشیان خستم وە هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو . تاکو چوومە ژوورەوە بۆ لای خەلیفە ... کاتێ کە خەلیفەم بینی لە جێگاکەی خۆی دانیشتووە زۆر ترسام و هەموو گیانم دەستی بە لەرزین کرد.. خەلیفە گوتی:- وەرە پێشەوە .. منیش چوومە پێشەوە ... پێی گوتم:- کوڕم هیچ مەترسە و ئارام بە .. ئەمجار دەستی بە قسەی خۆش کرد و دڵنیای کردمەوە کە هیچ ترسم نەبێت ... بۆیە منیش ترسم نەما ... گوتی:- تۆ بووی لەم ناوەختەدا بانگت دا ....؟ گوتم:- بەڵێ ئەی ئەمیری ئیمانداران ... گوتی:- چی هۆیەك هەیە کە لەم ناوەختەدا بانگ بدەی . لە کاتێکدا هێشتا زۆری ماوە بۆ بانگی بەیانی؟ کە دەبێتە هۆی ئەوەی کات لە رۆژووان و رێبواران و نوێژخوێنان وئافرەتان تێك بدەی ... گوتم:- ئایە ئەمیری ئیمانداران دڵنیام دەکاتەوە کە هیچم بەسەر نەیەت ئەگەر چیرۆکەکەم وەکو خۆی باس کرد؟ گوتی:- دڵنیا بە .. منیش چیرۆکەکەم بۆی گێڕایەوە .. ئەویش زۆر پەست بوو..ئەمجار فەرمانی کرد بە ئامادەکردنی ئەو پیاوە وئەو ئافرەتە ... ئەوانیش بە پەلە ئامادەیان کرد... ئەمجار ئافرەتەکەی لەگەڵ چەند ئافرەتێکی نزیکی خۆی

ناردەوە بۆ ماڵی خۆی ..پاشان رووی کردە پیاوەکەو پێی گوت:- رزق و رۆزیت چەند هەیە؟ سەروەت و سامانت چەند هەیە؟ چەند ژن و جاریەت هەیە؟ شتی زۆری بۆ باس کرد ... ئەمجار گوتی:- هاوار بۆخۆت .. ئایە ئەو هەموو نیعمەتە خوای گەورە رژاندوویەتی بە سەرتدا بەست نییە تاکو بڕۆیت پەردەی حەرام بدڕیت و سنورەکانی خوا ببەزێنیت و بە جورئەتیش بوی بەرامبەر بە دەسەڵات؟ ئەی ئەو هەموو نیعمەتە بەست نییە تاکو دەست درێژیت کردووەتەوە سەر کەسێك کە فەرمانی پێت کردووە بە چاکە و نەهی کردووی لە خراپە و هەموو لاشەت بریندار و خوێناوی کردووە و سوکایەتیت پێ کردووە؟؟ کەچی هیچ وەلامێکی نەبوو .. ئەمجار بڕیاری داو کە پێیەکانی بە کۆت و زنجیر ببەستنەوە و بە توندی بەستیانەوە .. لە کاتێکدا ئەو کابرایە هاوار دەکات و تکا دەکات .. وەبڕیاری تەوبە وگەڕانەوە دەدات کەچی خەلیفە بە هیچ شێوەیەك رووی تێ ناکات .. ئەمجار خەلیفە فەرمانی کرد کە بە چەقۆ لێی بدەن تاکو مردن و ئەمجار فەرمانی کرد کە بخرێتە روباری دیجلەوە .. ئەوە دوا ساتەکانی ئەو کابرایە بوو .. پاشان خەلیفە فەرمانی کردە بەڕێوەبەری پۆلیس کە بچێتە سەر ماڵەکەی ئەو هەموو پارەی لە (بیت المال) ەوە وەری گرتووە دەست بەسەر هەموویدا بگیرێت، وە بە منی گوت:- هەر کاتێك خراپەیەکت بینی بچووك یان گەورە تەنانەت ئەگەر لەسەر ئەم کابرایەیش بوو (دەستی درێژ کرد بۆ بەڕێوەبەری پۆلیس) ئەوا ئاگادارم بکەرەوە ئەگەر منت بینی ئەوا باشە ئەگەر نا ئەوا نیشانەی نێوان من و تۆ بانگدانە .. ئەوا لە هەر کاتێکدا بوو بانگ بدە .. یان لەم کاتەی ئێستادا کە بانگت دا .. منیش گوتم:- خوا پاداشتی خەیرت بداتەوە .. ئەمجار دەرچوومە دەردەوە .. لە بەر ئەوەیە هەر کاتێك فەرمانێك بکەمە هەر یەکێك لەو بەرپرسانە

ئەوا یەكسەر جێبەجێ دەكەن وە هەركاتێك قەدەغەیان بكەم لەهەر شتێك ئەوا یەكسەر وازی لێ دەهێنن لە ترسی خەلیفەی موسڵمانان (المعتضد بالله) .. وە تاكو ئێستا پێویستم بە بانگدان نەبووە لە خوا بە زیاد بێت ·

برای خۆشەویست .. خوشكی رێزدارم ...

ئەوانەی ئامەزرۆی بەهەشتن .. ئەوانەی حەز لە چوونە ناو بەهەشت دەكەن... لە كاتێكدا ئەگەر خراپەیەك ببینن ئەوا بێ دەنگ نابن .. بەڵكو هەموو ڕێگاكان دەگرنە بەر .. وە هەموو شێوازەكان دەگرنە بەر بە مەبەستی لادانی خراپە و ئامۆژگاری خەڵكی خراپەكار .. ئەوانە لە كوێن . كە ئەگەر خراپەیەك ببینن كەچی هەوڵ نادەن بۆ چاككردنەوە ... وە ڕەنگە ئەگەر جارێك یان دوو جار ئینكاری بكەن و لێیان وەرنەگیرێت ..ئەوا لە چاكەكاری بێزار دەبن .. وە چیتر چەك فڕێ دەدەن ... وە ڕۆژی قیامەت پرسیاریان لێ دەكرێت دەربارەی ئەوانە.... خراپەكاری چەند زۆر بووە لە نێو خەڵكیدا؟! .. لە بازاڕەكانیاندا !... لەماڵەكەنیاندا! .. لە قوتابخانەكانیان! .. وەجێگای كاركردنەكانیان! .. تەنها لەبەر ئەوە نەبێت ﴿كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾ [المائدة: ٧٩] ·

واتە:- ئەوانە قەدەغەی یەكتریان نەدەكرد لە خراپە و تاوانێك كە دەیانكرد، سوێند بێت بە خوا ئەوەی كە دەیكەن زۆر خراپ و ناپەسەندە ·

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:- (لا يحقر أحدكم نفسه) گوتیان:- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ:- كيف يحقر أحدنا نفسه؟! قال:- (يرى أمراً لله عليه فيه مقال

.. ثم لا يقول فيه، فيقول الله له يوم القيامة: ما منعك أن تقول في كذا وكذا؟ فيقول: خشية الناس .. فيقول: فإياي كنت أحق أن تخشى)[١٣].

وە فەرموودەکەی پێغەمبەری خواﷺبزانە کە دەفەرمووێت:-

(من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه. فإن لم يستطع فبقلبه، وذلك أضعف الايمان)[١٤].

هەموو موسڵمانێك دەگرێتەوە ئافرەت و پیاو .. وە تۆ یەکێکی لە موسڵمانان بەڵکو ئەو کەسەی کە لە بینینی خراپە بێدەنگ دەبێت با لەوە بترسێت کە ببێتە هاوەڵی ئەنجامدەری کارە خراپەکە .. پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت:- (إذا عملت الخطيئة في الأرض كان من شهدها فكرهها _ وقال مرة: أنكرها _ كمن غاب عنها ومن غاب عنها فرضيها كان كمن شهدها)[١٥].

## ئامۆژگاری پێنجەم ....

لە خۆشەویستییەکانی خوا بۆ بەندە چاکەکانی ..ئەوانەی کە ئەهلی بەهەشتن .. خوای گەورە خۆشگوزەرانی دونیا وقیامەتیان پێ دەبەخشێت...وە بزانە ئەو بێزارییەی کە خوای گەورە بە سەر هەندێ کەسدا دەیهێنێت بە هۆی سەرپێچی خۆیانەوەیە ...یان دەیانەوێ خۆشگوزاریان دەستکەوێ لە جگە لە ڕەزامەندی خوا ... سەرپێچی کەران دونیایان لا تەنگ دەبێت ... وە ژیانیان لا بێ سوود دەبێت ..تاکو ئەو خۆشییەی کە بە شوێنیدا دەگەڕێن لە خۆشگوزەرانی دونیا دەبێتە سزا و ئازار کە پێوەی دەناڵێنن ... بۆ گوێ بیستنیان بۆ گۆرانی .. و شوێنکەوتنی خراپەکاری .. و خواردنەوەی مەی و تەماشا کردنی حەرام .. هەموو

---

(١٣) (رواه ابن ماجة، وضعفه الشيخ الألباني في ضعيف ابن ماجه ٨٠٠٨)٠
(١٤) (رواه مسلم، وانظر. صحيح الجامع الصغير: ٦٢٥٠)٠
(١٥) (رواه ابو داود، وصححه الشيخ الألباني في صحيح سنن ابي داود ٤٣٤٥)

ئەوانە دەگۆڕدرێت بە تەنگی ژیان لە پاش ئەو هەموو فراوانییە .. وە خەم و پەژارە لە پاش دڵخۆشی .. بۆ؟ وەڵام ئاشکرایە .. چونکە خوای پەروەردگار مرۆڤی دروستکردووە تەنها بۆ یەك مەبەست بۆیە بە بێ ئەو مەبەستە ژیانی راست نابێت ئەگەر بە شتی ترەوە خۆی خەریك بكات:

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُون ﴾ [الذاريات: ٥٦].

واتە:- بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن بەتاك وتەنهاو هاوبەشم بۆ بڕیار نەدەن.

کاتێ مرۆڤەکان جەستەو گیانی خۆیان بۆ کارێکی تر بەکار هێنا کە بۆ ئەو مەبەستە دروست نەکراوە ئەوا ژیانی دەبێتە دۆزەخ .. وە نمونەیەك لەسەر ئەوە وەربگرە ...:- ئەگەر مرۆڤێك لە ڕێگایەکەوە ڕێ دەکرد لە ناکاو نەعلەکەی بچڕا.. کاتێ ئەوەی بینی دەڵێت:- هیچ کێشە نییە لە جێی نەعلەکەم پێنوسەکە بەکار دەهێنم ئەمجار پێنوسەکەی لە ژێر پێی خۆی دانا و ویستی ڕێ بکات .. ئەوا ئێمە پێی دەڵێین:- تۆ شێتی، چونکە پێنووس دروست کراوە بۆ نووسین و بۆ لە پێ کردن دروست نەکراوە.... وە هەروەها ئەگەر کەسێك پێویستی بە پێنوسێك هەبوو وە دەستی نەکەوت ئەوا دەڵێت:- هیچ کێشە نییە بە پێڵاوەکەم دەنووسم...!! ئەمجار پێڵاوەکەی هەڵگرت و بەسەر کاغەزەکەدا هێنای بە مەبەستی نووسین .. ئەوا ئێمە پێی دەڵێین .. تۆ شێتیت، چونکە پێڵاو بۆ یەك مەبەست دروست کراوە ئەویش ڕێ کردنەو بۆ نووسین دروست نەکراوە .. هەروەها مرۆڤیش وایە.. بۆ یەك مەبەست دروست کراوە ئەویش گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورەیە و پەرستنی ئەوە .. ئەگەر هەرکەسێك ژیانی خۆی بۆ جگە لەم مەبەستە بە کاری هێنا ئەوا ڕێگا بزر دەکات و تووشی ناخۆشی ژیان

دێت ... وە ئەگەر تەماشایەکی حاڵی ئەو کەسانە بکەیت کە ژیانی خۆیانیان بۆ جگە لەو مەبەستە بە کار هێناوە ئەوا دەبینیت ژیانیان پڕ لە خراپەکاری و گومڕاییە کە لە جگە لەواندا نییە .. لەگەڵ مندا ئەم پرسیارانە بکە:- بۆ خۆکوشتن لە وڵاتانی خراپەکاری و ئیباحی زۆرە؟ بۆ لە وڵاتی ئەمریکا ساڵانە زیاتر لە بیست و پێنج هەزار کەس خۆی دەکوژێت؟ وە وەکو ئەو نمونەیە لە وڵاتی بەریتانیا .. هەروەها فەرەنسا .. وڵاتی سوید و وڵاتانی تر .. بۆ خۆیان دەکوژن؟؟!! ئایە (مەی)یان دەست نەکەوتووە بۆ ئەوەی بیخۆنەوە؟ نەخێر .. بەڵکو مەی زۆر زۆرە ... ئایە نازانن بۆ چی وڵاتێك سەفەر بکەن؟ نەخێر .. بەڵکو وڵاتان زۆر فراوانن ... یان ڕێگای زینایان لێ گیراوە .. یان ڕێگرێك هەیە لە نێوان ئەوان و یاریگاکان و مەلهەکاندا؟.. نەخێر .. بەڵکو ئەوەی دەیانەوێ دەیکەن .. لە نێو خۆشگوزەرانی چاوەکانیان ودامێنیان رادەبوێرن .. کەواتە بۆ خۆیان دەکوژن؟ .. بۆ لە ژیان بێزار بوونە؟! بۆ مەی و زینا و مەلهەکان جێ دەهێڵن ... و مردن هەڵدەبژێرن .. بۆ؟ وەڵام ئاشکرایە ..

﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً﴾ [طه: ١٢٤].

واتە:- ئەوەی روو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من و پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی تاڵ وناخۆش وتەسك وتەنگی بۆ هەیە لە ژیانی دونیادا.

تەنگی ژیانیان شوێنیان دەکەوێت بۆ هەر کوێ بڕۆن .. وە لە سەفەرەکەیدا و لە جێگیر بوونەکەیدا .. لە گەڵیاندایە کاتی دەخۆن و دەخۆنەوە .. لە گەڵیدا هەڵدەستێ و دادەنیشێت .. وە پێکەوە دەبن لە خەوتن و نوستن دا.. ژیانی لێ

تاڵ دەکات تاکو مردن .. هەرکەسێ پشت لە خوا بکات و خۆی بە زل بزانێت . ئەوا خوای گەورە بەردەوام ترس دەکاتە دڵییەوە . خوای گەورە دەفەرموێت:-

﴿سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُواْ الرُّعْبَ﴾ [آل عمران ١٥١] .

واتە:- (ئەی گرۆی ئیمانداران دڵنیابن) کە لەمەودوا ئێمە: ترس و بیم فڕێ دەدەینە دڵی ئەوانەی کە بێ باوەڕن، بۆ؟ ﴿بِمَا أَشْرَكُواْ بِاللّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَاناً وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ وَبِئْسَ مَثْوَى الظَّالِمِينَ﴾ [آل عمران: ١٥١] .

واتە:- بە هۆی ئەوەی شەریك و هاوەڵیان بۆ خوا بڕیارداوە بێ ئەوەی خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر ناردبێتە خوارەوە (بۆ دانانی هاوەڵگەری)، ئەوانە سەرەنجامی گەڕانەوەیان ئاگری دۆزەخە کە ناخۆشترین و خراپترین جێگەی ستەمکارانە .

بەڵام ئەوانەی کە خوای خۆیان دەناسن ...کە بە دڵ روویان تێ کردووە .. ئەوانە لە خۆشگوزەرانیدا دەژین ..

﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ [النحل ٩٧] .

واتە:- ئەوەی کار و کردەوەی چاکەی کردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت، لە کاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بە خوا بە ژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دونیادا دەیژێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بە جوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیانکرد .

## مامۆستایەك گوتی:-

بە مەبەستی چارەسەرکردن چووم بۆ بەریتانیا .. چوومە ژوورەوە بۆ یەکێك لە گەورەترین نەخۆشخانەکانی ئەوێ ... دەتوانم بڵێم تەنها گەورە پیاوان و وەزیرەکان دەڕۆن بۆ ئەوێ ... کاتێ کە پزیشکەکە هاتە ژوورەوە بۆ لام و

ڕواڵەتی منی بینی .. گوتی:- تۆ موسڵمانیت؟ گوتم:- بەڵێ .. گوتی:- لەو ڕۆژەوە کە خۆم ناسیوەتەوە کێشەیەك هەیە منی سەرسام کردووە .. ئایە دەتوانی گوێم لێ بگریت؟ گوتم:- بەڵێ .. گوتی:- من سەروەت و سامانێکی زۆرم هەیە .. وە کارو کاسبییەکی باشم هەیە ... وە بڕوانامەیەکی بەرزم هەیە.. وە هەموو جۆرە خۆشگوزەرانییەکم تاقیکردووەتەوە .. هەموو جۆرە مەیەکم خواردۆتەوە ... وە توشی زینا هاتووم ... وە سەفەرم کردووە بۆ چەندەها وڵات... لەگەڵ ئەوەیشدا .. هەست بە دڵتەنگییەکی بەردەوام دەکەم .. وە بێزارم لەم ژیانە خۆشە .. چوومە بۆ لای چەندەها پزیشکی دەروونناس.. وە چەندەها جار بیرم لە خۆکوشتن کردۆتەوە بەڵکو ژیانێکی خۆشتر ببینم ... کە بێزاری تیادا نەبێت .. ئایە تۆ هەست بەم بێزارییە دڵتەنگییە دەکەیت؟ گوتم:- نەخێر.. بەڵکو من بەردەوام لە خۆشیدام .. وە ئێستا ڕێگات پیشان دەدەم بۆ خۆشگوزەرانی .. بەڵام وەڵامم بدەرەوە .. تۆ ئەگەر ویستت بە چاوەکانت ڕابوێرێ ..ئەوا چی دەکەیت؟ گوتی:- تەماشای ئافرەتێکی جوان یان دیمەنێکی جوان دەکەم ... گوتم:- ئەگەر ویستت بە گوێیەکانت ڕابوێرێ.. چی دەکەیت؟ گوتی:- گوێبیستی موسیقایەکی لەسەرخۆ دەبم ..گوتم:- ئەگەر ویستت بە لوتت ڕابوێرێ چی دەکەیت؟ گوتی:- بۆنی بۆنێکی خۆش دەکەم یان دەڕۆم بۆ باخچەیەك .. گوتم:- باشە .. ئەگەر حەزت کرد بە چاوەکانت ڕابوێرێ بۆ گوێبیستی موسیقا نابیت؟ بۆیە سەرسام بوو گوتی:- نابێت چونکە ئەمە ڕابواردنی تایبەت بە گوێیە .. گوتم:- ئەگەر ویستت بە لوتت ڕابوێرێ بۆ تەماشای دیمەنێکی جوان ناکەیت؟ دیسان سەرسام بوو گوتی:- نابێت چونکە ئەم ڕابواردنە تایبەتە بە چاوەوە، وە ناکرێت هەست بەو تەنگی و بێزارییە بکەیت لە چاوەکانت؟ گوتی:- نەخێر.

گوتم:- هەست بە گوێیەکانت دەکەیت؟ بە لوتت ! دەمت؟! دامێنت؟ گوتی:- نەخێر بەڵکو بە دڵ هەستی پێ دەکەم .. بە سنگم ... گوتم:- تۆ هەست بەم بێزارییە دەکەیت لە دڵتدا .. وە دڵیش ڕابواردنی تایبەت بە خۆی هەیە .. ناکرێت بە شتی ترەوە ڕابوێرێ.. وە دەبێت ئەو شتە بزانیت کە دڵ پێی خۆش دەبێت .. چونکە بە گوێ گرتنت لە موسیقا و خواردنەوەت بۆ مەی وە تەماشا کردنت و زینا کردنت ... ئەوا خۆشی بە دڵت نادەیت بەڵکو ئەوا تەنها خۆشی ئەندامەکانە ... بۆیە کابرا سەرسام بوو .. گوتی:- ڕاستە ئایە چۆن خۆشییەك بۆ دڵەکەم پەیدا بکەم؟ گوتم:- بەوەی کە شایەتی بدەیت کە هیچ خوایەك نییە کە بە حەق شایانی پەرستن بێت تەنها ﴿الله﴾ نەبێت، وە شایەتی بدەیت کە محمد ﷺ پێغەمبەرو نێردراوی ئەوە .. وە لەبەر دەستی دروستکارەکەی خۆتدا کڕنۆش ببەیت.. وە هەموو کێشە و ئازارەکانت بۆ ئەو باس بکەیت .. بۆیە تۆ بەو کارە ئەوا ژیانێکی خۆش بەسەر دەبەیت و چیتر غەمبار نابیت، کابرا هەندێ ڕاماو گوتی:- هەندێ کتێبم لەسەر ئیسلام بدەرێ .. و دوعام بۆ بکە .. پاشان من چارەسەری خۆم کرد و گەڕامەوە... وە ڕەنگە کابرا پاش من ئیسلام بوو بێت .. وە خوای گەورە ڕاستی فەرمووە کاتێك دەڵێت:-

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَاء لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ * قُلْ بِفَضْلِ اللّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ [يونس: ٥٧-٥٨].

واتە:- ئەی خەڵکینە، بە ڕاستی ئێوە ئامۆژگارییەکی گەورە و گرنگتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە (قورئانە) شیفا و چارەسەریشە بۆ نەخۆشی دڵ و دەروونەکان و ڕێ نیشاندەر و ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران (ئەی محمد ﷺ) بە

ئیمانداران بڵێ: با دڵشاد و شادمان بن بە فەزڵ و بەخشش و ڕەحمەتی خوایی (کە قورئـان و بەرنامـەی خوایـە)، کـەوابوو بـا هـەر بـەوە دڵخـۆش بـن، هـەر ئـەوەیش چـاکترە بۆیـان لـە هـەموو ئـەو شـتانەی کـە خـەڵکی خـەریکن کـۆی دەکەنـەوە و کەڵەکەی دەکەن ٠

سەیرە بۆ هەندێ کەس کە لەم دینەدا ئارامی و حۆشی دەبیـنن پاشـان دەڕۆن لـە جگە لەو ڕێگایە بە دوای خۆشیدا دەگرێن، خوای گەورە دەفەرموێت:-

﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ [الجاثية: ٢١] ٠

واتە:- ئایە ئەوانەی کە گوناهو تاوانەکانیان ئەنجامـداوە، وایـان زانیـووە هـەروەك ئەوانـە حـسابیان بـۆ دەکـەین کـە ئیمانیـان هێنـاوە و کـار و کـردەوە چـاکەکانیان ئەنجامـداوە؟! ژیـانی دنیـاو مـردن و دوای مردنیـان وەك یـەك دەبێـت؟!ئـای کـە بڕیاری خراپ بریار دەدەن.

بۆیە خوای گەورە ژیانی خۆشگوزەرانان و ژیانی بەدبەختانی لە ژیان و مردندا جیـا کردووەتەوە..

**مامۆستایەك گوتی:-**

ڕۆژێك گەنجێك هـات بـۆ لام . تەماشـای ڕوویـم کـرد بینـیم ڕوویـەکی بێـزار و ڕەش هەڵگـەڕاوە .. پرسـیاری داواکەیـەم کـرد .. بـێ دەنـگ بـوو .. پرسـیارەکەم لێـی دووبارە کردەوە کەچی هیچ قسەی نەکرد .. تەماشایەکیم کرد .... بینـیم فرمێـسك بە چاوەکانیدا دێتە خـوارەوە ... پرسـیارم کـرد .. بـۆ دەگـری؟ گـوتی:- هێنـدە سنگم تەنگە بە ڕادەیەك کە ناتوانم هەناسە بدەم بە هۆی بێزارییەوە .. سوێند بە خوا ئەی مامۆستا وا هەست دەکەم کـە چیایەك وا بەسـەر سـنگمەوەیە هەناسـەی

لێم قەدەغە کردووە .. چیتر بەرگەی تێکەڵ بوونی خەڵکی ناگرم .. وە بێزارم لە هاوڕێکانم .. بەڵکو تەنانەت برا و باوك و دایکم ... چیتر بەرگەی ئەوە ناگرم لە گەڵیاندا دانیشم.. تەنانەت پێکەنینەکەم دروستکراوە .. وە خۆشحاڵییەکەم تەنها روخسارە ... ئێستا هاتووم بۆ لات بۆ ئەوەی بە دوعا خوێندن بەسەرمدا چارەسەرم بکەیت .. یان ڕێگەم نیشان بدەیت بۆ لای کەسێك کە چارەسەرم بکات، ئەمجار دەنگی بڕا و بێ دەنگ بوو .. پرسیارم لێ کرد .. ئەم بێزارییە بێ گومان هۆیەکی هەیە ... ئایە هۆیەکەی چییە؟ گوتی:- نازانم .. گوتم:- پەیوەندیت لەگەڵ خوادا چۆنە؟ گوتی:- خراپە ..ئێستا گوێ لە چیرۆکەکەم بگرە.. گوتم:- فەرموو .. گوتی:- کاتێ تەمەنم گەیشتە چواردە ساڵ.. باوکم رۆیشت بۆ ئەمەریکا بە مەبەستی خوێندن .. منیش لە گەڵیدا رۆیشتم .. لەوێ باوکم منی فەرامۆش کرد لە نێو سەما خانەکان و بازاڕەکاندا لە کاتێکدا من تەمەنم لەو کاتە ناسکەدایە . کاتێ باوکم لە پاش دوو ساڵ خوێندنی تەواو کرد گەڕاینەوە بۆ ریاض، داوام لێ کرد کە بگەڕێمەوە بۆ ئەمەریکا بە مەبەستی تەواو کردنی خوێندن کەچی ئەو رازی نەبوو . منیش ساڵ سێیەمی ناوەندیم خوێند بەڵام بە قەستی نەمدەخوێند بۆ ئەوەی دەرنەچم و سەرنەکەوم لە هەموو وانەکاندا.. ساڵی دووەم دیسان خوێندم و دیسان بە قەستی بایەخم بە خوێندن نەدەدا بۆ ئەوەی دەرنەچم .. بۆ ساڵی سێیەم دیسان کاری ساڵانی پێشووم ئەنجامدا و دیسان دەرنەچووم .. کاتێ باوکم ئەوەی بینی ناردمی بۆ ئەمەریکا بۆ ئەوەی لەوێ خوێندن تەواو بکەم .. ئەبوایە بۆ ماوەی چوار ساڵ خوێندنی ئامادەیی تەواو بکەم کەچی من بە نۆ ساڵ تەواوم کرد .. هیچ تاوانێك و سەرپێچییەك لەسەر زەوییدا نەما کە من ئەنجامی نەدەم .. چونکە من دەمویست

بە گەنجییەکەی خۆم رابوێرم تا لە توانامدایە .. ئەمجار گەڕامەوە بۆ ریاض و دەستم کرد بە خوێندن لە زانکۆ .. لە کاتێکدا من بەردەوامم لە تاوان و سەرپێچی.. گەورە و بچووك .. بەلام ئەمە زۆر دلی تەنگ دەکردم .. هەناسەکانم بە ئەستەم دەردەچوو .. ژیانی لێ تەنگ کردم .. لە هەموو شتێك بێزار بووم .. هەموو شتێکم تاقی کردبووەوە .. کەچی بێزاری هەردەم هاوڕێمە .. ئەم هەموو قسەیەی بۆ کردم ... قسەکانی بە بچڕ بچڕ دەردەچوو .. دەگریا ... پرسیارم لێ کرد:- ئایا نوێژ دەکەیت؟ گوتی:- نەخێر .. گوتم:- یەکەم چارەسەری ئەم دڵتەنگییەی تۆ ئەوەیە کە پەیوەندیت باش بکەیت لەگەڵ ئەو کەسەدا کە دڵت لەبەر دەستیدا بە ویستی خۆی ئەم دیو و ئەودیوی دەکات.. پارێزگاری لە نوێژەکانت بکە لە مزگەوت .. وە دەمەوێ پاش حەوت رۆژی تر بتبینم .. رۆژگار رۆیشت .. پاش هەفتەیەك هات بۆ لام بە روویەك کە ئەو رووەی پێشوو نەبوو .. وە یەکەم جار کە منی بینی باوەشی پیاکردم .. گوتی:- خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە .. ئێستا من لە خۆشییەکدام کە بۆ نۆ ساڵ دەچێت تامی ئەو خۆشییەم نەچێشتووە .. ئەمجار پرسیاری دڵتەنگی و بێزاریم لێ کرد .. بینیم ئەو هەموو بێزارییەی لەسەر نەماوە .. خوای گەورە راستی فەرمووە:

﴿فَمَن يُرِدِ اللّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقاً حَرَجاً كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾

[الأنعام: ١٢٥] .

واتە:- جا ئەو کەسەی (خێری تێدا بێت) و خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی ساف و پاك و فراوان وئامادە دەکات بۆ ئایینی ئیسلام، ئەو کەسەش خوا بیەوێت گومڕای بکات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سنگی توندو تەنگ وتەسك دەکات و

هەناسەی سوار دەبێت، هەر وەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز بێتەوە (چۆن تووشی تەنگە نەفەسی و دڵ تەنگی و خوێن بەر بوون دەبێت)، ئا بەو شێوەیە خوا گومڕایی و پیسی هاوەڵگەری لەسەر دڵی ئەوانە دادەنێت کە باوەڕ ناهێنن﴾.

مامۆستایەك بۆی باس کردم:-

ڕۆژێك کابرایەك هات بۆ لام و گوتی:- ئەی مامۆستا براکەم جادووی لێکراوە، وە داوات لێ دەکەم کە ڕێنموییمان بکەی بۆ کەسێك کە هەندێك قورئانی بە سەردا بخوێنێ .. وە بە (روقیەی شەرعی) چارەسەری بکات .. منیش داوام لێ کرد کە براکەی ببینم .. کاتێ هات بۆ لام .. بینیم ئەم نەخۆشە زۆر بێزارە و دڵتەنگە .. حاڵی تێك چووە .. پرسیارم لێ کرد بەدەست چییەوە دەناڵێنیت؟ .. گوتی:- من جادووم لێ کراوە .. پرسیارم لێ کرد .. نیشانەکانی ئەو جادووەی کە لێت کراوە چییە؟ گوتی:- هەموو کاتێك هەست بە دڵتەنگی دەکەم .. هەموو کاتێك بێزار و نائارامم .. لە هەموو شتێك بێزار بووم .. وە حەز لە تێکەڵ بوونی خەڵك ناکەم .. تەنانەت دایکم و خوشکەکانم چیتر بەرگەی تێکەڵ بوونیان ناگرم .. لەگەڵ خێزانەکەمدا کێشەی زۆر ڕوویدا و ئێستا ڕۆیشتووەتەوە بۆ لای کەس و کاری بۆ ماوەی ساڵێکە ... منداڵەکانم حەز ناکەم لە گەڵیاندا دانیشم .. ئەمجار قسەکانی بچڕ بچڕ کرد و دەستی بە گریان کرد .. منیش گوتم:- تۆ بۆ سووری لەسەر ئەوەی کە جادووت لێ کراوە .. ڕەنگە ئەوەی تووشت بووە سزای خوای گەورە بێت لەبەر هەندێ لە تاوانەکانت ... ڕەنگە خوای گەورە کاتێ بینیبێتی تۆ سەرپێچی دەکەیت ئەوا سنگ فراوانی لێت سەندووەتەوە .. وە خوای گەورە دەفەرمووێ:-

﴿وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ﴾ [الشورى: ٣٠].

واته:- هەر بەڵاو نەهامەتیەکتان بە سەر هاتبێت، ئەوە دەرەنجامی ئەو کار و کردەوانەیە کە بە ئارەزووی خۆتان دەتانکرد، (بەڵام ئەوەندە خوایەکی میهرەبانە) لە زۆربەی زۆری گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت.

گوتی:- نەخێر .. من جادووم لێ کراوە و تکایە (روقیەی شەرعی)م بە سەردا بخوێنە .. گوتم:- لێپرسینەوەی خۆت بکە و چاودێری کارەکانت بکە و مژدەی چاك بوونەوە بخوازە .. گوتی:- نەخێر من جادووم لێ کراوە و شتێك بە سەرمدا بخوێنە .. کاتێ وازی نەهێنا و سوور بوو لەسەر داواکەی منیش پەرداخێك ئاو کە بە تەنیشتمەوە بوو هەڵم گرتو ئەمجار سورەتی (الفاتحە)م بە سەردا خوێند و فووم پیاکرد ...ئەمجار گوتم:- بیخۆرەوە .. ئەوا بە سەرتدا خوێندمەوە .. ئەویش ئاوەکەی خواردەوە و دەرچوو .. لە پاش دوو رۆژ براکەی پەیوەندی پێوە کردم و گوتی:- ئەی مامۆستا .. مژدەم بدەیە ..خوای گەورە بەو خوێندنەوەی تۆ سوودی پێ بەخشی .. منیش سەرسام بووم .. گوتم:- چۆن؟ گوتی:- براکەم دوێنێ تاکو ئێوارە لای دایکم و براکانم بوو .. وە ئێوارە رۆیشت منداڵەکان و خێزانەکەی هێنایەوە .. سوێند بێت بە خوا دایکم و خێزانەکەی بەردەوام دوعات بۆ دەکەن .. وە خوا پاداشتی خەیرت بداتەوە کە ئەو جادووەت پووچ کردەوە .. منیش والله سەرسام بووم بەو شتە .. وە داوام لێ کرد کە خۆی وبراکەی سەردانم بکەن .. کاتێ ئامادە بوون .. بەڵام شتێکی ترم بینی .. هاه .. ئەی فلان .. جادووەکەت دۆزییەوە؟ گوتی:- نەخێر بەڵام شتێکی ترم دۆزییەوە .. ئەویش فیلمی رووت و ماددە بێهۆشکەرەکان .. گوتم:- چۆن؟ گوتی:- کاتێ لای تۆ دەرچووم لێپرسینەوەم لەگەڵ خۆمدا کرد و سەرنجی ئەو ئایەتەم دەدا .

﴿وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ﴾ [الشورى: ٣٠] .

ڕۆیشتم بە شوێن کەلێنەکاندا دەگەڕام .. بینیم من بەردەوام نیم لەسەر نوێژەکان.. لەسەر ئەوەیشەوە من ماوەیەك بەردەوام تەماشای فلیمی ڕووت دەکەم .. لەبەر زۆری تەماشا کردنم بۆ ئەو فیلمانە خێزانەکەی خۆم لەبەر چاو کەوتووە ورقم لێی هەستاوە .. وە منداڵەکانیشم .. وە بەردەوام دڵتەنگی هاوڕێم بوو.. ئەمجار منیش لەبەر زۆری غەم و پەژارە دەستم کرد بە خواردنی مادده بێ هۆشکەرەکان .. بۆ ئەوەی ئەو هەموو غەم و پەژارەم لەسەر نەمێنێ .. کەچی غەمەکانم زیاتر و زۆرتر بوون .. وە منیش لەبەر زۆری دڵتەنگی وامدەزانی جادووم لێکراوە .. پاشان ئەو هەموو فیلمانەم کۆ کردەوەو هەمووم سووتاند .. ئەمجار ئەو مادده بێ هۆشکەرانەی کە لام مابوون هەموویم فڕێدا .. وە بڕیاری تەوبە و گەڕانەوەم دا بۆ لای پەروەردگار ... سوێند بە خوا لە پاش ئەوەی ئەو کارانەم کرد .. هەستم کرد کە چیایەك لەسەر سنگم بووە و ئێستا نەماوە..

**ئامۆژگاری شەشەم ...**

ئەهلی بەهەشت خەڵکێکن کە دڵی خۆیانیان پەیوەست کردووە بە خۆشەویستی خوداوە .. خوای خۆیان خۆشیانی دەوێت و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێت .. خوایان لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەوێت ... لە کەس و کار زیاتر .. لە سەروەت و سامان زیاتر .. لە خۆیان زیاتر .. چەندەها جار لە شەوگاراندا لەگەڵ خوای خۆیاندا دوو بە دوو دەبوونەوە .. بە ڕۆژیش لە ترسی ئەودا دەگریان .. چاوەکانیان تامەزرۆی بینینی ئەو دەکەن .. وە لەبەر گەورەیی و خۆشەویستی ئەو دڵیان پارچە پارچە بووە ..

فليتك تحلو والحياة مريرة ... وليتك ترضى والأنام غضاب
وليت الذي بيني وبينك عامر ... وبيني وبين العالمين خراب

إذا صح منك الود فالكل هين          وكل الذي فوق التراب تراب

واتە:ـ

ئەی خودایە خۆزگە تۆ شیرین دەبویت لەگەڵ مندا، با هەموو ژیان تاڵ بێت

وە خۆزگە تۆ ڕازی دەبویت لەمن با هەموو خەڵکی لێم پەست بن

وە خۆزگە ئەوەی لە نێوان من و تۆدایە ئاوەدان دەبوو

وە ئەوەی لە نێوان من و هەموو خەڵکیدایە با وێرانە بێت

ئەگەر خۆشەویستیت بەرامبەر بە من تەواو دەبوو ئەوا هەموو شتێك ئاسانە

وە هەموو ئەوەی کە لەسەر ئەم گڵەیە هەر گڵە

تامەزرۆی بینینی خوای خۆیان بوون تاکو شایەتی ئەوە بوون کە لە رۆژی دوایی دا خوای خۆیان ببینن خوای گەورە موژدەی ئەوەی پێداون:

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ * إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ [القيامة: ٢٢ - ٢٣]٠

واتە:ـ ئەو رۆژە، رووخسارانێك گەشاوە و ناسك و ئاسوودەن، چونکە هەریەکە بۆ خۆی تەماشای پەروەردگاری دەکات ( لە تەماشاکردنی تێر نابێت ) ٠

تۆیش ببە یەکێك لە ئەوان .. وریابە نەبیتە کەسێك کە دڵیان پەیوەست بووە بە عەشقی حەرامەوە .. رەنگە تۆ کەسێکت خۆش بوێت لەبەر ئەوەی شەو نوێژ دەکات .. یان بە رۆژ بە رۆژوو دەبێت ... یان قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە .. یان کەسێکی بانگەواز کار بۆ دینی خوا .. ئەم خۆشەویستی یە بۆ خوایە و خاوەنەکەی پاداشتی دەست دەکەوێت ... وە ئەوانەی لەبەر خوا یەکتریان خۆش دەوێت لە رۆژی دوایی دا لەسەر مینبەری نورن، پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەبەن، بەڵام رەنگە کەسێکت خۆش بوێت لەبەر جوانییەکەی یان دەنگە خۆشەکەی یان........... بێ ئەوەی تەماشای چاکسازی و گوێڕایەڵی بۆ

خـوا بکـرێ ئـەم خۆشەویـستییە بـۆ خـوا نییـە ... وە لـە پـەروەردگار دوورت دەکاتەوە، وە خوای گەورە هەرەشەی لەوانە کردووە:

﴿الْأَخِلَّاء يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ﴾ [الزخرف: ٦٧] .

واته:- دۆستان و برادەران هەر هەموو لەو ڕۆژەدا دوژمنی یەکترن، هـەموو ڕقیـان لە یەك دەبێتەوە، جگە لەو کەسانەی کە لەسەر بنچینەی تـەقوا و خواناسـین کۆ بوونەتەوە و برایەتییان بەرپا کردووە .

وە دەفەرموێت:- ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلاً * يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَاناً خَلِيلاً * لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولاً﴾ [الفرقان ٢٧ - ٢٩] .

واته:- ڕۆژێك دێت ستەمکار قـەپ دەکات بە هـەردوو دەسـتی خۆیدا و گـاز لـە هــەردوو دەسـتی خـۆی دەگرێـت (لـە پەشـیمانیدا و) دەڵێـت: خۆزگـە لەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ ڕێبـازی ئیمـانم بگرتایـە مـەرگ بـۆ خـۆم، خۆزگـە فـلان کەسـم نەکردایەتە هاوەڵ و دۆستی خۆم (چونکە سەری لێشێواندم) بـە ڕاسـتی گـومڕا و وێڵی کردم لە بەرنامەی خوا دوای ئەوەی کە پێم ڕاگەینرا بوو، شەیتان هەمیشە و بـەردەوام هـانی مرۆڤــ دەدات بـۆ گونـاهو تـاوان، لـە کـاتی تەنگانەشـدا پـشتی بەردەدات . بەڵکو ئەوانەی کە لەبەر خوا یەکتریان خۆش ناوێت ئەوانەی کە لەسەر ڕەوشتێك کۆبوونەتەوە کە خوای پەروەردگاری پێ پەست دەبێت لە ڕۆژی دواییـدا سزا دەدرێن وە خۆشەویستییەکەیان دەگۆڕدرێت بە دوژمنایەتی، هـەروەکو خـوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضاً وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ﴾ [العنكبوت: ٢٥] .

واتـە:- دواجـار لـە ڕۆژی قیامەتـدا یـەکتر کـافر دەکـەن و یەخـەی یـەکتر دەگـرن، هەندێکیشتان نەفرین لە هەندێکی ترتان دەکەن، سـەرەنجامیش شـوێن و جێگـەی دیاریکراوتان ناو ئاگرە ٠

وە لــە گــەورەترین هۆکارەکــانی چــوونە نــاو ئــەو جــۆرە عەشــقە حەرامــەوە تەماشاکردنی فیلمی سووک و ریسوا .. کە تیایدا ئافرەت و پیاوان تێکەڵ دەبن ... تاکو تەماشاکەر تێکەڵ بوون دەبێتە شتێکی ئاسایی ... ئـەمجار ئـەمیش دەست دەکات بە گەڕان بە دوای خۆشەویستێکدا .. وە لەوە گەورە تر ئەوەیە ئەگەر لە فیلمەکاندا ڕووداوی خۆشەویستی و عەشق و ماچ کردنـی یەکتری تیادا بێت ... ئەگـەر گـەنجێك یـان کـچێك ببـینێ ئـەوا هەسـتەکانی دەبزوێنرێـت و شـاراوەکان دەردەکەون و شەرم نامێنێ و فیتنە و بەلاّ نزیـك دەبێتـەوە .. وە هـەروەها ئەگـەر کەسێك وێنـەی خراپـەی بینی یان دیمـەنی خراپ .. بـێ گومـان لـە ناخیـدا حـەز دەکات کە چاوی لێ بکات لـە هـەموو کاتێکدا .. لـەناو بازاڕدا .. لەسـەر جێگـەی خۆی .. لە نوسینگەکەی .. وە شەیتان بەردەوام بـانگی دەکـات بۆ ئـەنجام دانـی کـاری خراپـە .. بۆیـە خـوای پـەروەردگار کاتێـك کـە فـەرمانی پـێ کـردووین لـە پاراسـتنی داوێـن لـە داوێـن پیسی .. لـە پـێش ئـەوەدا فـەرمانی کـردوە بـە چـاو داپۆشین لە حەرام .. خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ [النور: ٣٠] ٠

واتــە:- ئــەی پێغەمبــەر ﷺ بــە پیــاوانی ئیمانــدار بڵــێ: چـاویان بپـارێزن (لـە سەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم) هەروەها نامووس و عەورەتـی خۆیان لـە حـەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکتر و پوختترە بۆیان ( بۆ دڵ و دەروون و ڕواڵـەت و ڕوح و لاشەیان) بە ڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵس و کەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن ٠

خـوا بكـرێ ئـەم خۆشەویـستییە بـۆ خـوا نییـە ... وە لـە پـەروەردگار دوورت دەكاتەوە، وە خوای گەورە هەڕەشەی لەوانە كردووە:

﴿الْأَخِلَّاء يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ﴾ [الزخرف: ٦٧] .

واتە:- دۆستان و برادەران هەر هەموو لەو رۆژەدا دوژمنی یەكترن، هـەموو رقیـان لە یەك دەبێتەوە، جگە لەو كەسانەی كە لەسـەر بنچینەی تـەقوا و خواناسـین كۆ بوونەتەوە و برایەتییان بەرپا كردووە .

وە دەفەرموێت:- ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَـا لَيْتَنِـي اتَّخَـذْتُ مَـعَ الرَّسُولِ سَبِيلاً * يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَاناً خَلِيلاً * لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْـدَ إِذْ جَاءنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولاً﴾ [الفرقان ٢٧ - ٢٩].

واتە:- رۆژێك دێـت ستەمكار قـەپ دەكـات بـە هـەردوو دەسـتی خۆیـدا و گـاز لـە هــەردوو دەســتی خــۆی دەگرێــت (لــە پەشــیمانیدا و) دەڵێــت: خۆزگــە لەگــەڵ پێغەمبـەردا ﷺ رێبـازی ئیمـانم بگرتایـە مـەرگ بـۆ خـۆم، خۆزگـە فـلان كەسـم نەكردایەتە هاوەڵ و دۆستی خۆم (چونكە سەری لێشێواندم) بـە راسـتی گـومڕا و وێڵی كردم لە بەرنامەی خوا دوای ئەوەی كە پێم راگەینرا بوو، شەیتان هەمیشە و بـەردەوام هـانی مرۆڤــ دەدات بـۆ گونـاهو تـاوان، لـە كـاتی تەنگانەشـدا پــشتی بەردەدات . بەڵكو ئەوانەی كە لەبەر خوا یەكتریان خۆش ناوێت ئەوانەی كە لەسەر رەوشتێك كۆبوونەتەوە كە خوای پەروەردگاری پێ پەست دەبێت لە رۆژی دواییـدا سزا دەدرێن وە خۆشەویستییەكەیان دەگۆڕدرێت بە دوژمنایەتی، هـەروەكو خـوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضاً وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ﴾ [العنكبوت ٢٥] .

واتە:- دواجار لە ڕۆژی قیامەتدا یەکتر کافر دەکەن و یەخەی یەکتر دەگرن، هەندێکیشتان نەفرین لە هەندێکی ترتان دەکەن، سەرەنجامیش شوێن و جێگەی دیاریکراوتان ناو ئاگرە ·

وە لە گەورەترین هۆکارەکانی چوونە ناو ئەو جۆرە عەشقە حەرامەوە تەماشاکردنی فیلمی سووك و ڕیسوا .. کە تیایدا ئافرەت و پیاوان تێکەڵ دەبن ... تاکو تەماشاکەر تێکەڵ بوون دەبێتە شتێکی ئاسایی ... ئەمجار ئەمیش دەست دەکات بە گەڕان بە دوای خۆشەویستێکدا .. وە لەوە گەورە تر ئەوەیە ئەگەر لە فیلمەکاندا ڕووداوی خۆشەویستی و عەشق و ماچ کردنی یەکتری تیادا بێت ... ئەگەر گەنجێك یان کچێك ببینێ ئەوا هەستەکانی دەبزوێنرێت و شاراوەکان دەردەکەون و شەرم نامێنێ و فیتنە و بەڵا نزیك دەبێتەوە .. وە هەروەها ئەگەر کەسێك وێنەی خراپەی بینی یان دیمەنی خراپ .. بێ گومان لە ناخیدا حەز دەکات کە چاوی لێ بکات لە هەموو کاتێکدا .. لەناو بازاڕدا .. لەسەر جێگەی خۆی .. لە نوسینگەکەی .. وە شەیتان بەردەوام بانگی دەکات بۆ ئەنجام دانی کاری خراپە .. بۆیە خوای پەروەردگار کاتێك کە فەرمانی پێ کردووین لە پاراستنی داوێن لە داوێن پیسی .. لە پێش ئەوەدا فەرمانی کردوە بە چاو داپۆشین لە حەرام .. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ [النور: ٣٠] ·

واتە:- ئەی پێغەمبەر ﷺ بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم) هەروەها نامووس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکتر و پوختترە بۆیان ( بۆ دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ڕوح و لاشەیان) بە ڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵس و کەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن ·

وە لە فەرمودەدا هاتووە: (چاوەکان زینا دەکەن و زینا کردنی چاو تەماشا کردنە)[١٦] وە هەروەها لە هۆکاری پەیوەست بوون بەو جۆرە عیشقەوە گوێ گرتنە لە گۆرانی .. وە أبن مسعود ﷺ فەرموویەتی:

( گۆرانی رێگا و هۆکاری زینایە) سەیرە !.. ئەم قسەیەی ابن مسعود ﷺ لە کاتێکدا گوتراوە کە گۆرانی لە لایەن کەنیزە و بەندەکانەوە دەگوترا لە رۆژێکدا کە گۆرانی بە دەف و شیعری پاراو بووە ... هێشتا (خوای لێ رازی بێت) دەیفەرموو رێگا و هۆکاری زینایە .. ئەی ئاخۆ ئەگەر ئەم سەردەمەی ئێمەی ببینایە چی دەگوت؟ لە کاتێکدا کە دەنگەکان و ئاوازەکان هەمە رەنگ بوون ...وای لێ هاتووە کە گوێ بیستی گۆرانی دەبین لەناو ئۆتۆمبیل دا .. لە فرۆکەدا .. لە وشکانی و دەریادا .. وە لە گۆرانیدا چەندەها خراپەکاری هەیە کە هەمووی باس لە خۆشەویستی و عەشق و رابواردن دەکات .. سوێندت دەدەم بە خوا .. ئایە هیچ گۆرانی بێژێکت بینیوە کە باسی چاو داپۆشین لە حەرام بکات؟ یان خزمەت کردن و چاودێری کردنی هەتیوان؟ یان نوێژ کردن لە مزگەوتدا؟ یان تەوبە؟ نەخێر شتی وامان نەبیستووە .. بەڵکو جام هەرچی شتێکی تیادا بێت هەر ئەوەی لێ دەرژێت ئەو گۆرانی بێژە دڵی پڕ بووە لە ئارەزوو شەهەوات و پەیوەست بووە بە لەزەتەکانەوە ئەمجار ئەوەی لە توانایدایە خەرجی دەکات لەو پێناوەدا .. پەیوەست بوونی دڵی گەنجێك بەرامبەر گەنجێکی تری وەکو خۆی .. یان کچێك بۆ کچێکی تر .. بە راستی ئەوە مەترسییەکی گەورەیە و خراپەیەکی مەزنە .. بە کەم زانینی تەماشا کردنی حەرام دەیخاتە نێو یەکێك لەو دوو کارە ترسناکە یان عەشقی ئافرەت یا خود عەشقی منداڵی بێ موو، وە بەردەوام شەیتان لە گەڵیدا

(١٦) (صلاح الخمس ٩٣).

دەبێ تاکو دەیخاتە نێو تاوانەوە وە خوا پەنا بدات، خوای گەورە زەمی ئەو جۆرە تاوانە پیسەی کردووە و کردوویەتی بە هاوڕێی شیرك و کوشتن فەرموویەتی:
﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾ [الفرقان: ٦٨] ٠

واتە:- هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بە حەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون ٠

ئەمجار خوای گەورە باسی سزای داوێن پیسەکان دەکات لە ڕۆژی دواییداو دەفەرموێ:
﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً * يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً * إِلَّا مَن تَابَ﴾ [الفرقان: ٦٨-٧٠] ٠

واتە:- جا ئەوەی ئەو کارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوە تووشی سزا و ئازار و ریسوایی دەبێت، لە قیامەتیشدا ئازار و سزای بۆ چەند جارێك دەکرێت و بە زەلیلی و خەجاڵەتی و شەرمەزارییەوە دەبێت ژیانی تێدا بەسەر بەرێت، مەگەر ئەو کەسەی کە تەوبە بکات ٠

چەندەها ئافرەت گەنجی خۆی لە دەست داوە .. کەس و کاری خۆی توشی شەرمەزاری کردووە .. یان خۆی کوشتووە لە پێناوی شتێکدا کە پێی دەڵێن عیشق چەندەها گەنج ڕۆژگار و کاتی خۆی بە سەر بردووە و تەمەنی خۆی داناوە لە پێناوی عیشقدا .. ئێمە لەسەردەمێکداین کە هۆکارەکانی تاوان و جۆرەکانی شەهوەت زۆر بوون .. خراپەکاران لە کەناڵەکان و گۆڤارەکانیان وازیان هێناوە لە دواندنی عەقڵ و تێگەیشتن ڕوویان کردووەتە دواندنی غەرائز و وروژاندنی حەرام ..

بۆیە کچان و کوڕان سەرسام ماون لە نێوان گۆڤارێکی فریودەر و ئارەزوو شەهەوتێك لە ناخدا پەنگی خواردووەتەوە، وە کەناڵێك کە رووتی نیشان دەدات.. فیلمێك کە خراپەکاری جوان دەکاتەوە .. وە دەرمانی هەموو ئەوانە هاوڕێتی کەسی باشە و چاوداپۆشینە و ژن هێنانە و پڕ کردنەوەی کاتەکان بە کردارێك کە سوودمەند بێت .. وە گومان لەوەدا نییە کە ژیانی خۆشگوزەرانی زۆر و، کەمی ئیمان مرۆڤ بەرەو ئەو تاوانانە دەبات ..

**مامۆستایەك پێی گوتم:-**

ئامۆزاییەکم هەبوو لە یەکێ لە وڵاتە دراوسێکان نیشتەجی بوو .. کە سفوری تیادا ئاشکرایە .. ئەم پیاوە کابرایەکی دەوڵەمەند و خۆشگوزەران بوو .. کوڕ و کچەکانی گەورە بوون .. کاتێ کە یەکێك لە کچەکانی گەیشتە قۆناغی زانکۆ داوای لە باوکی کرد کە ئۆتۆمبیلێکی بۆ بکڕێ بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆی بگەڕێت .. باوکەکە پەست بوو گوتی:- ئۆتۆمبیل کلیلی خراپەکارییە .. رەنگە پیاو خراپ رێگەت پێ بگرێت .. وات لێ دەکات کە زیاتر لەگەڵ پیاواندا تێکەڵ بێت لە ناو شەقامەکاندا و لەگەڵ بەرێوەبەرایەتی پۆلیسی هاتوچۆدا و هتد .. من و براکانت هەرگیز کەم تەرخەم نەبووین لەگەڵ تۆدا .. بۆیە کچەکە سوور بوو لەسەر داواکەی دەستی بە گریان کرد تاکو باوکەکە ئۆتۆمبیلی بۆ کڕی .. ئەمجار ئەویش بە ارەزووی خۆی دەگەڕا .. کاتێ کە ساڵی یەکەم تەواو بوو وە کاتی پشوو هات بە اوکی گوت:- دەمەوێت کاتی پشووی خۆم لە وڵاتی بەریتانیا بەسەر ببەم لەگەڵ اورێکانمدا بە مەبەستی فێر بوونی زمانی ئینگلیزی .. باوکە هەژارەکە سەرسام و .. گوتی:- لە بەریتانیا؟ هیچ پێویست بەوە ناکات .. ئەویش سوور بوو سەر داواکەی ودەستی بە گریان کرد .. باوکەکە گوتی:- بەڵێ .. بڕۆ بۆ

بەریتانیا بەڵام من یاخود یەکێ لە براکانت لە گەڵتدا دێین .. ئەویش پەست بوو .. گوتی:- من باوەڕم بە خۆم هەیە.. نابێت توشی خراپە بێم بۆیە باوکەکە رازی نەبوو .. ئەویش دەرمانەکەی دەزانی .. دەستی بە گریان کرد .. دەرگای ژوورەکەی لەسەر خۆی داخست وازی لە خواردن و خواردنەوە هێنا .. تاوەکو باوکەکە بەزەیی پێادا هاتەوە و چاوەکانی پڕ فرمێسك بوو .. گوتی:- کچم لەو تەنیاییە دەرچۆ .. رێگات دەدەم سەفەر بکەی بۆ بەریتانیا .. کچەکە زۆر خۆشحاڵ بوو .. دەستی کرد بە کۆ کردنەوەی جانتاکانی و رێکخستنی جل و بەرگەکانی .. بەڵام باوکەکە ئەمجار خۆی پێ نەگیرا و ویستی چارەسەرێك بۆ ئەم کێشەیە دابنێ .. چی کرد؟ باوکەکە تەلەفونەکەی بەرز کردەوەو پەیوەندی کردە یەکێ لە خزمەکانی .. کە شارێکی سەر رێگای شاری مەککەی پیرۆز نیشتەجێ بووە پەیوەندی پێوە کردو پێی گوت:- ئەی فلان .. فلان کەسی ئامۆزامانت لە بیرە کە لەو دەشتە نیشتەجێیە؟ گوتی:- بەڵێ .. ئێستایش لەو دەشتەیە .. مەڕ وئاژەڵ بەخێو دەکات .. چەند سەر وشترێکی هەیە .. خەریکی فرۆشتنی رۆن وکەشکە .. کابرا گوتی:- ئایە ژنی هێناوە؟ گوتی:- نەخێر .. کێ ژن بە ئەو دەدات!! ئەو کابرایەکی دەشتەکییە و لە بیاباندا نیشتەجێیە .. جێگایەکی تایبەتی نییە و هەردەم لە کۆچ و باردایە .. کابرا گوتی:- باشە من پاش دوو رۆژی تر دێم بۆ مەککە و نانی نیوەڕۆ لای تۆ دەخۆین و دەمەوێت ئەویش بانگ بکەی تاکو نانی نیوەڕۆمان لەگەڵدا بخوات .. گوتی:- باشە .. ئەمجار خوا حافیزی لێ کرد و تەلەفونەکەی داخست .. باوکەکە بە کچەکەی گوت:- بە ئۆتۆمبیل دەچین بۆ عەمرە تۆیش لەوێوە سەفەر بکە بۆ بەریتانیا لە رێگای فرۆکەخانەی (جیددە)ەوە .. کاتێ کە رۆژی سەفەر هات .. هەموو جانتاکانی کۆ

کردەوە و ئەم خێزانە بە پشتیوانی خوا بەڕێ کەوتن.. کاتێ نزیك شاری مەککە بوونەوە باوکەکە بەرەو شاری هاوڕێکەی لەگەڵ منداڵەکانیدا بەڕێ کەوت و گوتی:- ماڵی فلان کەس لەوێیە هەندێ دەحەسێینەوە و نانی نیوەڕۆ دەخۆین و ئەمجار سەفەرەکەمان دەکەین .. گەیشتنە ماڵی هاوڕێیەکەی ژنان چون بۆ لای ژنان ئەویش چوو بۆ لای پیاوان .. لەگەڵ هاورێکەیدا یەکیان بینی (شوانی مەڕ و وشترەکان) زۆر لە گەڵیدا قسەی کرد .. ئەمجار پێی گوت کە ئەو دەیەوێت کچەکەی خۆی لێ مارە بکات ..ئەویش بە بێ یەك ودوو رازی بوو، پاشان کەسێکیان بانگ کرد کە مارەی ببڕێ .. مارەیان بڕی .. باوکەکە لە ماڵ دەرچوو هەموو جانتای کچەکەی .. بووکەکە .. لە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی گواستەوە بۆ ئۆتۆمبیلی کابرا .. ئەمجار بانگی کەس وکاری کرد دەرچن با بڕۆین .. خێزانەکەی لەگەڵ منداڵەکانیدا دەرچوون .. وە کچە ناسك و نازدارەکە لە ماڵ دەرچوو.. بە دەستەکانی جل و بەرگەکەی خۆی دەتەکاند .. دەینالاند بەدەست مێش ومەگەزەوە.. کاتێ کە ویستی لەگەڵ باوکیدا سوار بێت ئەو موژدەی شووکردنی پێدا .. لە سەرەتادا کچەکە وای زانی کە باوکەکە گاڵتەی لەگەڵ دەکات بەلام ئەو سوور بوو لەسەر قسەی خۆی ... فەرمانی پێ کرد کە لەگەڵ پیاوەکەیدا سوار بێت .. ئەویش رازی نەبوو .. دەستی بە گریان کرد .. خۆی پەیوەست کرد بە دایکییەوە .. باوکەکە رووی کردە پیاوەکە وگوتی:- خێزانەکەت شەرم دەکات لەگەڵ تۆدا سوار بێت وەرە خۆت بیبە .. کابرا بە دڵ خۆشییەوە دابەزی .. بەلارولەنجەوە .. دەرگای ئۆتۆمبیلەکەی کردەوە ..دەستی گرتوو بەرەو ئۆتۆمبیلەکەی خۆی بردی .. ئەمجار سواری ئۆتۆمبیلی کرد .. پاشان رۆیشتن .. بیابانیان بڕی.. لە نێو لم و گڵی بیاباندا وون بوون .. وە بەرەو خەیمەی

خۆشگوزەرانی بردی ... بەڵام باوکەکە یەکلا بوو لەسەر بڕیارەکەی .. تـوانی زاڵ بێت بەسەر گریان و پاڕانەوەی دایکەکەدا .. وە لەگەڵ منداڵەکانیدا گەڕانەوە بۆ شارەکەی خۆی.. هەفتەیەك بەسەر ئەو ڕووداوەدا ڕۆیشت .. باوکەکە پەیوەندی کردە کابراوە کە لە ماڵی ئەواندا مارەی کچەکەیان بڕی و هەواڵی کچەکەی و زاواکەی پرسی ... گوتی:- پێش دوو ڕۆژ لە بازاڕدا ئەوانم بینی .. لە خوا بە زیاد بێت زۆر باش بوون .. چەند ڕۆژ و مانگێك تێپەڕی .. باوکەکە بەردەوام لە ڕێگەی هاوڕێکەیەوە هەواڵی ئەوانی دەزانی بە تەلەفون .. کە ساڵێك تێپەڕی .. هاوڕێکەی پەیوەندی پێوە کرد و موژدەی پێ دا کە کچەکەی کوڕێکی بووە .. پاش چەند مانگێك ئەم خێزانە چوون بۆ سەردانی کچەکەیان .. گەیشتنە شاری هاوڕێکەی و ئەویشیان لەگەڵ خۆیاندا برد .. بیابانیان بڕی .. لە نێو لم و گڵ دا ڕۆیشتن .. دەستیان کرد بە گەڕان بە شوێن کچەکەیان و خەیمەکەیاندا ... لە کاتی گەڕاندا خەیمەکەیان بینی .. لەبەر دەرگاکەی ئافرەتێکی سك پڕ ڕاوەستاوە و منداڵێکی بە تەنیشتەوەیە.. کە نزیك بوونەوە و کچەکەی خۆیان بینی .. بەخێر هاتنی ئەوانی کرد و زۆر خۆشحاڵ بوو .. بانگی پیاوەکەی کرد و ئەویش هاتەوە و زۆر ڕێزی لێ گرتن .. ئەو شووکردنەی بەو کابرایە زۆر باشترە لە زانکۆکەی و لە بەریتانیا.. لەگەڵ تێبینی ئەوەی کە بە شوودانی کچ بە بێ ڕازی بوونی خۆی دروست نییە .. بەڵام من ئەم ڕووداوەم باس کردووە بۆ ئەوەی ئەنجامی لە خۆ بایی بوون و خۆشگوزەرانی بێ ئەندازە بزانین کە توشی کچان و کوڕان دەبێت .. جاری وا هەیە شەیتان وا لە کوڕان یان کچان دەکات کە هەست بکەن ئەوان زۆر جوان و سەرنج ڕاکێشن، یان گومان دەبەن کە لایەنی دووەم زۆر سەرسامی ئەم بوون . ئەگەر لە بازاڕدا ڕێ بکات یان لەگەڵ هاوەڵانیدا پێبکەنێت وا هەست

دەکات کە بووەتە هۆی سەرەنج ڕاکێشانی خەڵکی، وا دەزانێ خەڵکی تەماشای دەکات .. بۆیە ئەمە پاڵی پێوە دەنێت کە خۆی دەرخات بە جوانترین شێوە .. وە خەڵکی فێڵباز و خاوەن شەهەوات گاڵتەی پێ دەکەن تاکو ئارەزووەکانی خۆیان جێ بەجێ دەکات کاتێ کە ئارەزووەکەی خۆیان جێ بەجێ دەکەن ئەوا جێی دەهێڵن و بە شوێن نێچیرێکی تردا دەگەڕێن ..

**مامۆستایەك پێی گوتم:-**

لە یەکێ لە مزگەتەکاندا دەرسێکم هەبوو .. کاتێ کە دەرچووم بینیم گەنجێك لە تەنیشت ئۆتۆمبیلەکەم ڕاوەستاوە .. کە بینیم ترسام و پێم گوت:- چیت دەوێ؟ پێی گوتم:- ئەی مامۆستا بڕیارم داوە کە تەوبە بکەم.. وا هەستم کرد کە دەیەوێت لە قاچاغچییەتی تلیاك تەوبە دەکات .. یاخود ڕێگرتن .. یان کوشتن .. چونکە شێوەی لەوانە دەچوو .. بەڵام پرسیارم لێ کرد:- لە چی تەوبە دەکەیت؟ ووتی: لەگۆرانی ووتن بەسەر کچاندا .. سەرسام بووم .. بەڵام بێ دەنگ بووم پێم گوت:- بەڵێ سوپاس بۆ خوا کە یارمەتی داوین بۆ تەوبە .. هاواری کرد و گوتی:- بەڵام شتێك هەیە ڕێگەم لێ دەگرێ بۆ تەوبە کردن .. گوتم:- ئەوە چییە؟ گوتی:- من کاتێ بە بازاڕەکاندا تێ دەپەڕم کچان وازم لێ ناهێنن لە هەموو سووچێکەوە بەسەرمدا هەڵدەدەن ویانگم دەکەن .. تەماشاکەن شەیتان چۆن هەڵیخەڵەتاندووە ..زۆر سەیرە موسڵمان بە تەماشا کردنێك یاخود بە وتەیەك شەیتان هەڵیدەخەڵەتێنێ .. کەچی ئەویش باش دەزانێ کە لەسەر هەموو تەماشایەك و بچووکێك لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ ... وە لە گەورەترین سیفاتی ئەهلی بەهەشت ئارامگرتنە لەسەر شەهەوات بۆیە پێیان دەگوترێت لە ڕۆژی دواییدا:

﴿سَلاَمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾ [الرعد: ٢٤] ٠

واتە:– دەڵێن : سڵاوتان لێ بێت بە هۆی خۆگرتنتانەوە (لە بەرامبەر كێشەكانی ژیان، لە بەرامبەر گاڵتەجاڕی خوانەناسان ..) كەوابوو ئای چەندە جێگە و ڕێگەیەكی خۆشتان بۆ خۆتان مسۆگەر كرد ٠

بەڵام بە ئەهلی ئاگر دەگوترێت:

﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ﴾ [الأحقاف ٢٠] ٠

واتە:– هەرچی خۆشی و شادیەكتان هەبوو لە ژیانی دونیاتاندا ئەنجامتاندا بە ئارەزووی خۆتان ڕاتانبوارد، كەوابوو ئەمڕۆ ئیتر نۆرەی ئەوەیە كە سزای خەجاڵەتی و ریسوایی بدرێنەوە ٠

ئایە تۆ دەبیتە یەكێك لە ئارامگران لە سەر شەهەوات تاكو بەهەشتی بەرین ببەیتەوە؟؟ ..

## ئامۆژگاری حەوتەم ....

سوور بە لەسەر فێربوونی ڕێنماییەكانی ئەم دینەو فێركردنی .. وە ئەمەیش پەرستنێكی گەورەیە .. بەڵكو ئەوە كارو پیشەی پێغەمبەرانە(سەلات وسەلامی خوایان لەسەر بێت) كە ئەوانیش خاوەنی بەرزترین پلەو پایەن لە بەهەشتدا .. وە لەبەر ڕێزی عیلم و بەرزی پلە و پایەكەی خوای گەورە بە پێغەمبەرەكەی ﷺ فەرموویەتی:– ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْماً﴾ [طه:١١٤] ٠

واتە:– بڵێ:– پەروەردگارا، بەردەوام زانست و زانیاری زۆرتر و زیاترم پێ ببەخشە ٠

وە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ نەکردووە بۆ داواکردن و زیادکردنی هیچ شتێك تەنها زانیاری نەبێت .. ئەگەر تەماشای زۆربەی خەڵکی ئەمڕۆ بکەین زۆربەیان ئارەزووی فێربوون و فێرکردنی زانیاریان نییە.. ئارەزووی ئامادەبوونی دەرس و خوێندنی کتێبیان نییە .. زۆربەیان نوقمی دەریای نەفامی و جەهالەت بوون ..

ڕۆژێك گەنجێك ڕێی پێ گرتم کە لە قۆناغی زانکۆ دەیخوێند گوتی:- پرسیارێکم هەیە .. گوتم:- فەرموو پرسیارەکەت چییە؟ گوتی:- ئەگەر ویستم نوێژی سوننەت بکەم وەکو نوێژی (وتر) و (ضحی) ئایە پێویست دەکات دەست نوێژم هەبێت؟ یان بۆم هەیە بە بێ دەستنوێژ نوێژ بکەم؟ منیش سەرسام بووم لە پرسیارەکەی وا تێگەیشتم کە خراپ حاڵی بووم لە پرسیارەکەی داوام لێ کرد کە دووبارەی بکاتەوە .. کەچی بە هەمان شێوە دووبارەی کردەوە .. گوتم:- بەڵێ بێ گومان پێویستە لەسەرت دەستنوێژ بگری .. بۆ گومان لەوە هەیە؟ گوتی : - ئەم نوێژە بەخشینە (تبرع) لە خۆمەوە ئیتر بۆ دەستنوێژ بگرم؟ ...

**مامۆستایەك گوتی:-**

لە یەکێ لە مزگەوتەکاندا وتەیەکم پێشکەش کرد دەربارەی (الطهارة الكبرى والصغرى )خۆپاك کردنەوەی گەورە و بچووك .. کاتێ کە دەرچووم گەنجێك کە قوتابی زانکۆ بوو دەستی گرتم و گوتی:- ئەی مامۆستا باسی ئەوەت کرد کە ئەگەر یەکێك لە خەو هەستا و بینی لەشی گرانە بە هۆی خەو بینینەوە ..ئەوا غوسڵی لەسەرە .. گوتم:- بەڵێ .. ڕاستە .. هاواری کرد بە سەرمدا و گوتی:- ئایە تەنها دەستنوێژێکی لەسەرە وەکو دەستنوێژی نوێژ یان غوسڵێکی تەواو؟ گوتم:- بەڵکو غوسڵێکی تەواوی لەسەرە .. دەبێ ئاو هەموو لاشەی بگرێتەوە .

ئەگەر وا نەکات ئەوا لەشگرانییەکەی لەسەر نەڕۆیشتووە .. کەواتە نوێژەکەی دروست نییە .. گوتی:- سوێند بە خوا من چەندەها ساڵە کە توشی لەشگرانی دەبم لە کاتی خەوتندا ئەوا بە دەستنوێژێك وەکو دەستنوێژی نوێژ خۆم دەرباز دەکەم .. وە نەمزانیوە کە غوسڵ پێویست دەبێت لەم حاڵەتەدا تەنها ئێستا نەبێت .. وە هیچ سەیر نییە ئەم جۆرە پرسیارانە بکرێت لەم سەردەمەدا کە زانایان زۆر کەم بوونە و نەفامان زۆر بوونە .. بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەیاندووین کە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی کەم بوونی زانیاری و زۆربوونی نەفامییە .. لە فەرموودەیەکدا هاتووە ..

(إن من أشراط الساعة أن يرفع العلم ويكثر الجهل)(١٧) .

واتە: لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە زانست بەرزدەبێتەوەو نەفامی زۆر دەبێت.

وە هەروەها خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت:-

(تكون بين يدي الساعة أيام يرفع فيها العلم وينزل فيها الجهل)(١٨).

واتە: لەبەر دەستی قیامەتدا چەند ڕۆژانێك هەن کە تیایدا زانست بەرز دەبێتەوە و نەفامی دادەبەزێت وە هەرکەسێ تەماشای زۆربەی مەجلیسەکانی ئەمڕۆی خەڵکی بکات دەبینێت کە خۆیان سەرقاڵ کردووە بە سەرپێچی لە گوێگرتن و تەماشای حەرام .. یان بە چەند کردەوەیەکی بێ کەڵکەوە .. وە بە هەندێ گفت و گۆوە کە نە سوودی بۆ دونیایان هەیە نە بە دوارۆژیانەوە ...

---

(١٧) (متفق عليه، وانظر: مشكاة المصابيح: ٥٣٤٧).

(١٨) (صحيح الجامع الصغير: ٢٩٩٢).

**مامۆستایەك گوتی:-**

ڕۆژێك لە مەجلیسێکدا دانیشتم کە زیاتر لە چل پیاوی لە خۆ گرتبوو .. گفتوگۆیان زۆر بوو .. تاکو دەنگیان بەرز بووەوە . وە یەك سەعات بەو شێوەیان بەسەر برد.. هەوڵم دا کە بێ دەنگیان بکەمەوە کەچی نەمتوانی.. وە ئەو کەسەی کە بە تەنیشتمەوە دانیشتبوو لە هەموویان گەورەتر بوو .. داوام لێ کرد کە بێ دەنگیان بکات .. ئەویش هاواری بە سەریاندا کرد و بێ دەنگ بوون .. ئەمجار من بە ئەوانم گوت:- لەو کاتەوە لێرە دانیشتووین و ئێوە گفتوگۆ دەکەن دەربارەی چەند مەسەلەیەك کە نازانم لە پەڕەی چاکەکانتان دەنوسرێت یان لە پەڕەی خراپەکانتان .. بەڵام من پرسیارێکتان لێ دەکەم .. هەمووتان سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾تان لەبەر کردووە؟ .. هەموویان گوتیان:- بەڵێ . بەڵێ .. منیش گوتم:- ئایە مانای ﴿اللَّهُ الصَّمَدُ﴾ چییە؟ هەموویان بێ دەنگ بوون .. ئەمجار گوتم:- سورەتی (الفلق) تان لەبەرە؟ گوتیان:- بەڵێ .. بەڵێ .. گوتم:- ئایە مانای ﴿غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴾ چییە؟ هەموویان بێ دەنگ بوون ... گوتم:- ئێوە لە کاتی دانیشتنەکەتاندا ئەگەر تەفسیری ئایەتێکتان بخوێندایە .. یان مانای فەرموودەیەك .. یان حوکمێك لە حوکمەکانی ئەم دینە فێر بوایەن باشتر و چاکتر بوو .. وە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت:-

(أيما قوم جلسوا فأطالوا الجلوس ثم تفرقوا قبل أن يذكروا الله تعالى أو يصلوا على نبيه كانت عليهم ترة من الله إن شاء عذبهم وإن شاء غفر لهم)[١٩] .

واتە: هەر کاتێك هەر کۆمەڵێك دانیشتن و دانیشتنەکەیان زۆری پێچوو .. پاشان بڵاوەیان لێ کرد بە بێ ئەوەی یادێکی خوا بکەن .. و سەڵاوات بدەنە سەر

(١٩) (رواه الترمذي والحاكم، وصححه الشيخ الألباني في صحيح الجامع الصغير ٢٧٣٥).

پێغەمبەرەکەی ﷺ ئیللا لە لایەن خوداوە سزایەکیان بۆ هەیە .. ئەگەر ویستی هەبێت سزایان دەدات .. وە ئەگەر ویستی بوو لێیان خۆش دەبێت .. وە سەیر لەوەدایە کە کۆمەڵێك خەڵکی هەن مەجلیسەکەی خۆیان بە قسەی بێ سوودەوە بەسەر دەبەن .. ئەگەر زانایەك قسەیەك بکات ڕووبەڕووی دەبنەوەو هەست بە بێزاری دەکەن .. وە تامەزرۆی ئەوەن کە کاتی خۆیان بە قسەی بێ سوودەوە بە سەر ببەن .. وە ترس هەیە ئەوانە وەکو ئەو کەسانە بن کە خوای گەورە باسیان دەکات و دەفەرموێت:

﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ [الزمر: ٤٥] .

واتە: کاتێك کە بە تەنها ناوی خوا برا، ئەوانەی کە باوەڕیان بە قیامەت و ڕۆژی دوایی نییە دڵیان دەگیرێت و بێزاری دایان دەگرێت، بەڵام کاتێکیش باسی شتی تر بکرێت جگە لە خوا، دەستبەجێ دڵخۆش و کەیف خۆش دەبن و حەزی پێدەکەن دەگێڕنەوەو دەڵێن کە خالدی کوڕی صفوان _ کە یەکێکە لە ئەدیب و قسەزانەکان _ مەجلیسەکانی خۆی بە باسی هەواڵ و مێژوو و ئەدەبەوە ئاوەدان دەکردەوە .. ڕۆژێك کابرایەك پێی گوت:- ئەی ئەمیر .. ئەوە چییە ئەگەر بتانبینم باسی هەواڵەکان و دیراسەتی شوێنەوارەکان و شیعر بکەن .. ئەوا من هەست بە بێزاری دەکەم و خەوم دێت؟! خالد پێی گوت:- چونکە تۆ گوێدرێژێکی لە شێوەی مرۆڤ ؟ بەڵێ .. ئەو کەسەی لەم دونیایە خەمی تەنها خواردت و خواردنەوە و خەوتنە .. وە خۆی گێل دەکات لە وەرگرتنی زانیاری .. وە فێربوونی دین .. ئەوە وەکو وڵاخ وایە.. وە لە وێرانەوە زۆر نزیکە .. ژیانی سنووورداری هەیە .. وە هەناسەکانی ژمێردراون .. وە کاتەکانی بزر بوون .. تۆیش

وريابه كه ژيانت هەروا و به بێ كەڵك نەروات .. وه با تۆ ببيته كەسێكى دەست پێشخەر بۆ سوودى خەڵكى له مەجليسەكەياندا .. كتێبێكى سوود بەخش لەگەڵ خۆتدا بهێنه و بۆ ئەوانى بخوێنەوه ئەگەر بۆ ماوەى ده خولەكيش بووه .. مەجليسەكەى خۆتانى پێ پاك دەكەنەوه و وه نەفسى خۆتانيش پاك دەكەنەوه..

ابراهيم التيمى دەڵێت:- هاتم بۆ لاى (أبو يوسف القاضي) سەردانم دەكرد له كاتى نەخۆشەكەيدا بينيم بوراوەتەوه ..كاتێ هاتەوه سەرخۆى پێى گوتم:- ئەى ابراهيم .. كاميان باشتره بۆ حاجى له فڕێدانى بەرددا .. به پێوه فڕێى بدات يان به سوارى؟ گوتم:- به سوارى .. گوتى:- هەڵەت كرد.. گوتم:- به پێوه .. گوتى:- هەڵەت كرد .. گوتم:- قسەى خۆت دەربارەى بكه خوات لێ رازى بێت .. گوتى:- كاتێك له نزيكى دەوەستێت بۆ پاڕانەوه باشتر وايه به پێوه فڕێى بدات.. وه ئەگەر رانەوەستا ئەوا باشتره به سوارى فڕێى بدات .. گوتم:- خواى گەوره به عيلمەكەت سوود بەخشت بكات .. وه خوا پاداشتت بداتەوه .. كاتێ دەرچوومه دەرەوەو گەيشتمەوه نزيك دەرگاكه گوێم لێ بوو به سەريدا هاواريان دەكرد .. بينيم ئەو مردووه خوا رەحمى لێ بكات ..

وه(الفقيه الوالجي) دەڵێت:-

چوومه ژوورەوه بۆ لاى (ابى الريحان البيرونى) لەسەرەمەرگ وگيان كێشاندا بوو.. وه سنگى تەنگ بووه .. لەو كاتەدا مەسەلەيەكى له ميرات دابەشكردنى كەوته ياد .. كه من له پێش ئەوه باسم بۆى كردبوو .. پێى گوتم:- چۆنت بۆ باس كردم دەربارەى بەشى داپيرەكان له لايەن دايكەوه؟ منيش بەزەيم پيادا هاتەوه و گوتم:- لەم كاتەدا؟ پێ ى گوتم:- ئەى ئەو كەسه ! ئايه ئەگەر من دونيا به جێ بهێڵم لەو مەسەلەيه بزانم باشتر نييه لەوەى كه نەيزانم؟ خۆت رابهێنه له

سەر ئەوەی هیچ ڕۆژێك بە سەرتدا تێنەپەڕێت ئیللا چەند پەڕەیەکت لە کتێبێکی سوود بەخش خوێندبێتەوە.. یان فێری تەفسیری ئایەتێك بووبیت .. یان مانای فەرموودەیەك .. وە ئەگەر ڕۆژێك بە سەرتدا بڕوات وخواپەرستیت زیاد نەکات وە سوودمەندی زانستێك نەبیت ئەوە لە تەمەنت ڕۆیشتووە .. وە داواکردنی زانیاری هۆیەکە بۆ چوونە ناو بەهەشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:-

( .. ومن سلك طريقا يلتمس فيه علماً، سهل الله له به طريقاً إلى الجنة، وما أجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله ويتدارسونه بينهم إلا نزلت عليهم السكينة وغشيهم الرحمة وحفتهم الملائكة وذكرهم الله فيمن عنده، ومن بطأ به عمله لم يسرع به نسبه)[٢٠] .

## ئامۆژگاری هەشتەم:-

ئەهلی بەهەشت .. خوای خۆیانیان بە مەزنی ڕاگرتووە بە باشترین شێوە .. وە بەتەواوی لە خوای گەورە ترساون .. بۆیە ترسان لە دەرئەنجامە خراپەکانی تاوان.. وە وازیان لە تام و چێژی ژیان هێناوە .. لە پێناوی ئەوەی کاتێ کە گەیشتنە خوای خۆیان ئەو لێیان ڕازی بێت ..

(ماعزی کوڕی مالك) ﷛ کوڕێك بوو لە هاوەڵانی خۆشەویست ﷺ .. ژنی هێنابوو وە لە شاری مەدینە بوو .. ڕۆژێك شەیتان لە خشتەی برد .. جارییەی کابرایەکی پشتیوان .. خەڵەتاندی .. دوو بەدوو بوونەوە و لە چاوی خەڵکی ونبوون .. شەیتان سێهەمیان بوو .. بەردەوام جوانکاری بۆ هەردوولا دەکرد .. تاکو کەوتنە ناو حەرامەوە .. کاتێ کە (ماعز)﷛ لە تاوانەکەی بووەوە .. شەیتانی لێ دوورکەوتەوە، دەستی بە گریان کرد و سەرزەنشتی خۆی دەکرد .. وە لۆمەی

(٢٠) (رواه مسلم، وانظر: صحيح الجامع الصغير، ٦٥٧٧).

خۆی دەکرد .. وە لە سزای خوا ترسا .. وە ژیانی لێ تەنگ بوو .. وە تاوانەکەی لە هەموو لایەکەوە دەوری لێ دابوو .. تاوەکو تاوان دڵەکەی سوتاندبوو .. بۆیە هات بۆلای پزیشکی دڵان ﷺ .. وە لەبەر دەستیدا ڕاوەستاو لەبەر گەرمی و گەورەیی تاوانەکەی هاواری کرد و گوتی:- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.. دوور کراوەکە زینای کرد .. پاکم بکەرەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لێنەکرد و ڕووی هەڵگەڕانەوە لایەکی تر .. ئەویش چووە ئەولایەوە و گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من زینام کردووە پاکم بکەرەوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- هاوار بۆ خۆت بگەڕێوە .. داوا لە خوا بکە کە لێت خۆش بێت و تەوبە بکە .. ئەویش گەڕایەوە و بەڵام زۆر دوور نەکەوتەوە .. کەچی ئارامی نەگرت .. بۆیە گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی گوت:- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پاکم بکەرەوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- هاوار بۆ خۆت .. بگەڕێوە و داوای لێخۆشبوون بکە و تەوبە بکە .. دیسان گەڕایەوە و بەڵام دوور نەکەوتەوە .. ئەمجار گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پاکم بکەرەوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- هاوار بۆ خۆت.. ئایا دەزانی زینا چی‌یە؟ ئەمجار فەرمانی کرد کە دەری بکەنە دەرەوە .. بۆ جاری دووەم هاتەوە.. گوتی:- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زینام کردووە و پاکم بکەرەوە، فەرمووی:- هاوار بۆ خۆت .. ئایا دەزانی زینا چی‌یە؟ دیسان فەرمانی کرد کە دەری بکەنە دەرەوە .. بۆ جاری سێهەم و چوارەم بەم شێوەیە .. کاتێ کە زۆر دووبارەی کردەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ بە کەس وکاری فەرموو:- ئایا ئەم کابرایە شێت نییە؟ فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەمانزانیوە کە هیچ کەم و کورییەکی هەبێت .. فەرمووی:- ڕەنگە مەی خواردبێتەوە .. بۆیە پیاوێك

هەستاو بۆنی دەمی ئەوی کرد، کەچی بۆنی مەی لێ نەدەهات، خۆشەویست ﷺ فەرمووی:- ئایا دەزانی زینا چییە؟ گوتی:- بەڵێ چوومە لای ئافرەتێکەوە بە حەرام .. هەروەکو چۆن پیاو دەچێتە لای خێزانی خۆیەوە بە حەلاڵی .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- ئێستا بەم قسانەت چیت دەوێت؟ گوتی:- دەمەوێ پاکم بکەیتەوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- بەڵێ .. فەرمانی کرد کە بەرد باران بکرێت .. بۆیە بەرد باران کرا تاکو مرد .. کاتێ کە نوێژی لەسەر کرا و نێژرا .. پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەنیشتیەوە لەگەڵ هەندێ هاوەڵانیدا رضي الله عنهم تێپەڕی .. پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێبوو کە پیاوێك لە هاوەڵانی رضي الله عنهم .. بەوی تر دەڵێت:- تەماشای ئەمە بکە .. کە خوای گەورە تاوانەکەی شاردەوە .. بەلام خۆی وازی نەهێنا تاکو بەرد باران کرا وەکو سەگ .. پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو .. ئەمجا ماوەیەك ڕۆیشتن .. تاکو بە تەنیشت گوێدرێژێکی تۆپیودا تێپەڕین.. کە ڕۆژ سووتاندبووی تاکو ئاوسا بوو، وە هەردوو پێی بەرز بووەوە .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- کوان فلان و فلان؟ گوتیان:- ئێمە لێرەین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ .. گوتی:- لە لاکی ئەو گوێدرێژە بخۆن .. گوتیان:- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.. خوا لە گوناهەکانت خۆش بێت .. کێ ئەمە دەخوات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:- ئەوەی ئەنجامتان دا دەربارەی براکەتان پێش کەمێك .. لە خواردنی مردارەوەبوو خراپترە .. بەڕاستی ئەو تەوبەیەکی کردووە ئەگەر دابەش بکرێتە سەر ئوممەتێکدا ئەوا بەشی دەکردن .. سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە .. ئەو ئێستا لەناو ڕووبارەکانی بەهەشتدا مەلە دەکات .. مژدە بۆ(ماعزی کوڕی مالك)رضي الله عنه )[٢١].. بەڵێ کە کەوتە ناو زیناوە .. وە پەردەی نێوان

(٢١) (أصل القصة في الصحيحين، وسقتها هنا من مجموع رواياتها في الصحيحين وغيرهما).

خۆی و خواکەی دڕاند .. بەلام کاتێك لە تاوانەکەی بووەوە و تام و چێژەکەی ڕۆیشت .. وە تەنها پەشیمانی مایەوە .. وە تاوانەکانی لا گەورە بووەوە پەشیمان بووەوە و تەوبەیەکی کرد ئەگەر دابەش بکرێتە سەر ئوممەتێکدا بەشی دەکردن...

وە مەبەستمان لەم چیرۆکەی ماعز ئەوە نییە کە هەر کاتێك موسڵمانێك کەوتە نێو تاوانێکی گەورەوە ئەوا داوای جێ بەجێ کردنی سنوورەکان بکات .. بەلام مەبەستمان ئەوەیە ئەگەر یەکێك کەوتە نێو تاوانەوە.. ئەوا ئەو تاوانە زاڵ نەبێت بەسەر دڵیدا و لەگەڵیدا تێکەڵ ببێت و تەوبە نەکات.. وە پێغەمبەری خوا ﷺباسی حاڵی دڵانی کردووە و فەرموویەتی:-

( تعرض الفتن على القلوب كالحصير عوداً عوداً .. فاي قلب أشربها نكت فيه نكتة سوداء .. و أي قلب أنكرها نكت فيه نكتة بيضاء .. حتى تصير على قلبين .. على أبيض مثل الصفا .. فلا تضره فتنة ما دامت السماوات والأرض والآخر أسود مرباداً كالكوز مجخيا لا يعرف معروفاً ولا ينكر منكراً إلا ما أشرب من هواه)[22].

کوان ئێستا ئەو دڵە سپییانە ئەگەر تاوانێکیان ئەنجام دا ئەوا دڵیان دێتە لەرزە.. ئەوا بە بێ دواکەوتن تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا .. بە کەمزانینی تاوانەکان ڕێگایەکە بۆ خراپەکاری و شەرمەزاری .. لە دونیا و قیامەتدا .. وە ئەهلی بەهەشت ئەگەر یادی خوا بکەنەوە ئەوا یادیان دەکاتەوە .. ئایە دەربارەی (القعنبی) هیچت بیستووە؟ پێشەوا و زانا و فەرموودەناس .. ئەو لە گەنجیدا مەی دەخواردەوە و هاوڕێتی خراپەکارانی دەکرد .. ڕۆژێك هەندێ لە هاوەڵانی بانگیان کرد بۆ ئەوەی لای ئەوان سەرخۆش بێت .. وە لەبەر دەرگا ڕاوەستا بوو

(٢٢) (رواه مسلم، وانظر. مشكاة المصابيح: ٥٣٨٠، وصحيح الترغيب والترهيب. ٢٤١٩).

چاوەڕوانی ئەوانی دەکرد .. لەو کاتەدا (شعبەی کوڕی الحجاج) کە ئەویش پێشەوایەکی فەرموودەناس بوو .. لەوێوە تێپەڕی خەڵکی بە شوێنیدا دەڕۆیشتن.. (القعنبی) سەرسام بوو بە کۆبوونەوەی ئەو هەموو خەڵکە لەسەر ئەو پیاوە بە تەمەنە .. لە یەکێك پرسیاری کرد و گوتی:- ئەمە کێیە؟ گوتی:- پێشەوا (شعبەی کوڕی الحجاج) ە .. ئەویش بە گاڵتەوە گوتی:- شعبە چییە؟ گوتی:- فەرموودەناس .. زانا .. کاتێ کە (القعنبی) وشەی (فەرموودەناس) ی بیست هەستا و ڕۆیشت بەرەو لای شعبە و بە گاڵتەوە پێی گوتی:- فەرموودەم بۆ بگێڕەوە (واتە: لەبەر ئەوەی تۆ فەرموودەناسیت کەواتە فەرموودەم بۆ بگێڕەوە).. شعبە تەماشایەکی کرد و گوتی:- تۆ لەو کەسانە نیت (اصحاب الحدیث) نیت تاوەکو من فەرموودەت بۆ بگێڕمەوە .. بۆیە (القعنبی) پەست بوو .. گوتی:-( لە کاتێکدا کە چەقۆکەی دەرهێناوە) فەرموودەم بۆ دەگێڕیتەوە یان بە چەقۆکەم لێت بدەم ..؟ شعبە ڕووی تێ کرد و گوتی:- (منصور) بۆی گێڕامەوە لە (ربعی) یەوە لە (ابی مسعود)ەوە ﷺ گوتی:- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:-

(إذا لم تستح فاصنع ما شئت)[٢٣].

واتە: ئەگەر شەرم ناکەیت ئەوا چی دەکەیت بیکە.

کاتێ کە ( القعنبی) ئەم فەرموودەیەی بیست .. بە دڵێکی پاکەوە ئەم فەرموودەیەی وەرگرت .. وە کەوتە یادی کە ئەو چەندەها ساڵە دژایەتی خوا دەکات .. ئەمجار چەقۆکەی فڕێداو گەڕایەوە بۆ ماڵ .. ئەمجار ڕۆیشت بۆ لای هەموو ئەو مەییانەی کە هەیبوو هەمووی ڕژاند .. پاشان ئیزنی لە دایکی وەرگرت

(٢٣) (رواه الترمذي، وصححه الشيخ الألباني في صحيح الجامع الصغير: ٢٢٣٠).

بۆ ئەوەی سەفەر بکات بۆ مەدینە بۆ داواکردنی زانیاری، لەوێ بووە قوتابی لای (ئیمامی مالکی کوڕی أنس) .. تاکو لە ئەوەوە چەندەها فەرموودەی لەبەر کرد و بووە یەکێ لە گەورە فەرموودەناسان .. وە هۆی هیدایەت دانی تەنها ئامۆژگارییەکەی سەرپێی بوو .. بەلآم دلێکی زیندووی پێکا ..

## ئامۆژگاری تۆیەم ..

ئایە رێگایەکت نیشان بدەم بۆ پەرستنێك کە لە گەورەترین پەرستنەکانە..؟ کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەردەم ئەنجامی دەدا .. لە هەموو کات و ساتێکدا .. بەڵکو خوای گەورە فەرمانی بە ئیمانداران کردووە لە پاش نوێژ ئەنجامی بدەن .. وە پاش حەج .. بەڵکو لە کاتی جەنگدا .. وە لە پێش خواردن و پاش خواردن .. وە لە پێش خەوتن و پاش خەوتن.. وە لە پێش چوونە سەرئاو و پاش دەرچوون .. وە لەگەڵ ئەوەیشدا پێویستی بە رووکردنە قیبلە نییە .. وە پێویستی بە داپۆشینی عەورەت نییە.. وە پێویستی بە ئەنجامدانی نییە بە جەماعەت .. وە پێویستی بەوە نییە کە لە پێناویدا سەفەر بکەیت .. ئەم پەرستنە .. گەورە و بچووك دەتوانێت ئەنجامی بدەن .. وە دەوڵەمەند و هەژار .. وە زانا و نەفام .. وە دەست بەتاڵ و سەرقاڵ .. ئایە ئەم پەرستنە زانیت چییە؟؟ ئەوەیە کە خوای گەورە پیاو چاکان و ئافرەتانی موسڵمانانی پێوە هەڵناوە .. کە ئەوانە هەموو کات ئەنجامی دەدەن .. خوای گەورە دەفەرموێت:-

﴿وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾

[الأحزاب: ٣٥] .

واتە:- ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێ بووردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لە لایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادە کراوە ( هەر کە دنیایان بە جێ هێشت پێی شاد دەبن ) ·

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:-

(ألا أنبئكم بخير أعمالكم، وأزكاها عند مليككم، وأرفعها في درجاتكم، وخير لكم من إنفاق الذهب والورق، وخير لكم من أن تلقوا عدوكم فتضربوا أعناقهم ويضربوا أعناقكم؟ قالوا: بلى، قال: ذكر الله تعالى، فقال معاذ بن جبل رضي الله عنه: ما شيء أنجى من عذاب الله من ذكر الله)(٢٤) ·

واتە: ئایە باشترین کردەوەکانتان بۆ باس بکەم .. وە پاکترینیان بێت لە لای پادشاکەتان .. وە پێی بەرزترین پلەتان دەست بکەوێت .. وە باشتر بێت لە بەخشینی ئاڵتون وزیوو .. وە باشتر بێت بۆ ئێوە لەوەی کە بگەنە دوژمنەکانتان، ئێوە لە گەردنی ئەوان بدەن و ئەوانیش لە گەردنی ئێوە بدەن؟ گوتیان:- بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ..فەرمووی:- یادکردنەوەی خوای گەورەیە·

(معاذی کوڕی جبل رضي الله عنه) دەفەرموێت:- (هیچ شتێك نییە لە سزای خوا ڕزگارت بکات وەکو یادکردنەوەی خوا)·

وە (ابی هریرە رضي الله عنه) لە شەو و ڕۆژێکدا زیاتر لە دوازدە هەزار جار (سبحان الله) ی دەکرد .. !! وە دەیفەرموو:- من بەم (تسبیحات)انە خۆم لە ئاگر دەرباز دەکەم.. وە لە باشترین یادکردنەکان .. خوێندنی (آية الكرسي) یە لە پاش هەموو نوێژێکی فەرز .. پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێت:-

(٢٤) ( رواه الترمذي وابن ماجة، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح سنن الترمذي: ٣٣٧٧)·

(من قرأ آية الكرسي في دبر كل صلاة لم يحل بينه وبين دخول الجنة إلا الموت)[٢٥] .

واتە: هەر کەسێ لە پاش هەموو نوێژێك (آیـة الكرسـي) بخوێنێت هیچ ڕێگرێك لە نێوان ئەو و بەهەشتدا نییە تەنها مردن نەبێت.

وە دەفەرموێت:- (ما منكم من أحد يتوضأ فيسبغ الوضوء ثم يقول حين يفرغ من وضوئه أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأن محمدا عبده ورسوله إلا فتحت له أبواب الجنة الثمانية يدخل من أيها شاء)[٢٦].

واتە: هەر کەسێك لە ئێوە دەستنوێژێکی جوان بگرێت و ئەمجار بڵێت: (أشـهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأن محمداً عبده ورسوله) ئیللا هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەكرێتەوە لە هەر دەرگایەكەوە بە ئارەزووی خۆی دەچێتە ژوورەوە.

ببە کەسێك یادی خوا بکە لە هەموو سات و کاتێکدا .. بەڵێ .. ڕەنگە کەم تەرخەم بیت لەشەو نوێژەکانتدا .. یان ڕۆژوو گرتنی سوننەت .. یان صەدەقە .. ئەوا ئاگاداری خۆت بە و تەمبەڵی مەکە لە یادکەردنەوەی خوای گەورەدا .. کە هیچ خەرج ناکەیت .. وە خوای گەورە دەفەرموێت:-

﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُواْ لِي وَلاَ تَكْفُرُونِ﴾ [البقرة: ١٥٢] .

واتە:- دەی کەواتە ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بکەن، منیش یادی ئێوە دەکەم و سوپاسگوزاری من بن وسپڵەیی بەرامبەرم مەکەن.

---

(٢٥) (رواه الترمذي وابن ماجة، وصححه الشيخ الألباني في: سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٩٧٢).

(٢٦) (رواه النسائي وابن ماجة، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح الجامع الصغير: ٥٨٠٣).

## ئامۆژگاری دەیەم ...

ئایە سەرچاوەی وەرگردتنی دین لە لای تۆ چییە؟؟ پرسیارێكی گرنگە .. تێبینی ئەوەم كردووە كە هەندێ كەس شوێنی روخسەتەكان دەكەون .. وە خۆشحاڵ دەبن كاتێك كە كەسێك بە گوێرەی ئارەزووەكانیان فەتوایان بۆ بدات .. بەڵكو هەندێكیان ئەگەر فەتوایەكی بیست لەگەڵ ئارەزووەكەیدا بگونجی .. ئەوا لە خۆشیدا بۆی دەفڕێ و ئەو زانایە كە فەتواكەی بۆ داوە هەڵی دەنێت و دەڵێت:- بە راستی ئەمە شەیخێكی زانایە .. ئەمە ئەو شەیخەیە كە لە واقع حاڵی بووە .. ئەمە بە راستی لە بڕینی موسڵمانان دەزانێت .. ئەم قسەیە دەكات دەربارەی فەتواكەی هەرچەندە ئەو فەتوایە جیاواز بێت لەگەڵ قورئان و فەرموودەدا .. یان تمییعی تیادا بێت لە دیندا.. یان سووك كردنەوەی دەقێكی شەرعی .. یان گەڕان بۆفێڵ كردن دەربارەی روخسەتێك یان وتەیەكی لاواز (ضعیف) گرنگ ئەوەیە ئەوە فەتوایە .. فەتوا .. خوای گەورە لە رۆژی دواییدا یەك پرسیاری دیاری كراوت لێ دەكات:

﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ﴾ [القصص: ٦٥]·

واتە:- رۆژێك دێت خوا بانگیان دەكات و پێیان دەفەرموێت: ئەوە وەڵامی پێغەمبەرانتان چۆن دایەوە؟ پرسیارت لێ ناكات دەربارەی شەیخ فلان و فلان .. بەڵكو بە شوێنكەوتنی قورئان و سوننەت .. تەنها .. پرسیارەكە جارێكی تر دووبارەی دەكەمەوە .. ئایە سەرچاوەی وەرگرتنی دین لە لای تۆ چییە؟ ئایە هەركەسێك جوبەیەكی لەبەر كرد یان عەمامەیەكی بەستە سەرەوە، یان لە یەكێ لە كەناڵە ئاسمانییەكان دەرچوو .. وە (الحمد لله) دەستی بە قسەكانی كرد و بە (والله أعلم) كۆتایی پێ هێنا ئیتر ئەوە موفتییە؟ ئایە هەموو كەسێك شایەنی

ئەوەیە کە ببێتە سەرچاوەیەك بۆ وەرگرتنی دین لە ئەوە وە؟ تەنها پێوەر دەبێت ڕەچاو بکرێت لەسەر شەیخێکی موفتی ئەوەیە کە فەتواکانی لەگەڵ قورئان و فەرموودەدا بگونجێ: ﴿وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ [ص: ٢٦] .

واتە:- هەرگیز شوێنی ئارەزوو مەکەوە، تا نەبێتە هۆی گومڕاکردن و لادانت لە ڕێبازی خوا .

**مامۆستایەك گوتی:-**

لە یەکێك لە مزگەوتەکاندا دەرسێکم پێشکەش کرد .. یەکێ هات بۆ لام گوتی:- ئەی مامۆستا بۆ هێندە لەسەر بابەتی تێکەڵ بوون لەگەڵ ئافرەتدا توندی .. لە کاتێکدا کە شەیخ الدکتور (فلان) لە کەناڵی ( ..) دەڵێت:- تێکەڵ بوون لە نێوان پیاو و ئافرەتدا جائزە لە ولیمەکاندا و لە ئاهەنگەکاندا ئەگەر نییەت پاك بێت .. وەتەماشاکردنەکە بە بێ شەهوەت بوو ؟؟!! وە لە جێگایەکی تردا دەرسێکم پێشکەش کرد یەکێ هات بۆ لام.. گوتی:- ئەی شەیخ حوکمی سوو (ربا) چییە؟ گوتم:- حەرامە !! بە هەموو شێوە و جۆرەکانی .. گوتی:- ئەی بۆ شەیخ فلان لە کەناڵی (..) دەڵێت:- ئەوە پێویستییەکە لە پێویستییەکانی ئەم سەردەمە .. ئاساییە..

وەکەسی سێیەم هات بۆ لام فەتوایەکی دەویست دەربارەی حوکمی موسیقا .. ئەمجار گوتی:- شەیخ فلان گوتویەتی حەڵاڵە .. بەڕێزەکەم .. دینەکەی خۆت مەکە کاڵا بۆ هەموو کەسێك کە دەیەوێت کەمی لێ بکاتەوە یان لە سەرت تێکی بدات، چونکە تۆ بە تەنها لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکرێت.. وە بە تەنها پرسیارت لێ دەکرێت:

﴿مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ﴾ [القصص: ٦٥] .

واتە:– ئەوە وەڵامی پێغەمبەرانتان چۆن دایەوە؟ .
وە ئاگادار بە لەو کەسانە نەبیت کە شوێنی پێشەوا گومڕاکان دەکەون ..
وەپێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إنما أخاف على أمتي الأئمة المضلين)[٢٧] .
واتە: تەنها لە پێشەوایانی گومڕاکەر دەترسێم لەسەر ئوممەتەکەم.
وە کورتەی قسەکان ئەوەیە .. کە قسەی ئەو موفتییە ئاسانکارانە لە دیندا جێ بەجێ نابێت تەنها بەسەر کۆمەڵە خەڵکێکی شێت و نەفام نەبێت .. بەڵام عاقڵان ئەوانەن کە شوێنی هەموو دەنگێك ناکەون .. وە گوێ بگرە لەم دوو نمونە خۆشە:– یەکەمیان:– (غیاث ی کوڕی ابراهیم– پیاوێکی درۆزن بووە ودرۆی بەدەم پێغەمبەری خواوە ﷺ هەڵبەستووە) .. وای دەردەخست کە ئەو زانایە .. وە ئەوەی بڵاو دەکردەوە کە ئەو چەندەها فەرموودەی لەبەرە و دەیگێڕێتەوە .. وە لەناو خەڵکیدا ڕوویەك و زمانێکی پاراوی هەبوو ... خەڵکی لەسەری کۆ دەبوونەوە و ئەویش قسەی سەیری بۆ باس دەکردن و ئەوانیش باوەڕیان پێ دەکرد .. کابرایەك ڕۆژێك بینی کە غیاث کارێکی ناشیاو دەکات .. پێی گوت:– ئایە شەرم لە خەڵکی ناکەیت؟ گوتی:– خەڵکی لە کوێن؟ گوتی:– ئەوانەی کە لە لای تۆ کۆ دەبنەوە. گوتی:– مەبەستت ئەوانەیە!! ئەوانە خەڵکی نین .. ئەوانە مانگان .. وە ئەگەر دەتەوێت بۆت بسەلمێنم ئەوا لەگەڵ مندا وەرە .. ئەمجار ڕۆیشتن .. غیاث لە مەجلیسەکەی خۆیدا دانیشت و دەستی کرد بە باسی بەهەشت و وەسفی بەهەشتی بۆ دەکردن .. ئەوانیش بە بێ دەنگی گوێیان لێ دەگرت.. کاتێ بینی ئەوان لە گەڵیدا تێکەڵ بوون .. لە عەقڵی خۆیەوە فەرموودەیەکی ڕێك خست گوتی:– پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:– هەرکەسێ لە ئێوە توانی

(٢٧) (رواه الترمذي، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح الجامع الصغير: ١٧٧٣).

زمانی بدات لە لوتی ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە!! ئەمجار خەڵکی بە پەلە هەموویان زمانی خۆیان دەردەهێنا و هەوڵیان دەدا کە بیدەن لە لوتی خۆیان!! ئەمجار غیاث رووی لە هاوەڵەکەی کرد و گوتی:- ئایە پێتم نەگوت ئەوانە مانگان؟؟!!

وە دووەم باس ئەوەیە:- کابرایەك هەبوو کە پێیان دەگوت:- زانای فراوان (العلم الغزیر) ئەو وەلامی هەموو پرسیارێك دەداتەوە کە لێی بکەن .. وە هیچ رۆژێك نەیدەگوت لە هەر پرسیارێك کە بیانکردایە .. نازانم .. بەڵکو وەلامی جوانی بۆیان رێك دەخست .. وە بەلگەی بۆ هەموو وەلامێکی دادەنا .. وە لە پێش خەڵکی خۆی دەردەخست .. رۆژێك کۆمەلێك عاقلْ کۆ بوونەوەو گوتیان:- ئەم پیاوە یان زاناترین کەسی سەر زەوییە . یاخود ئەو نەفامی ئێمەی قۆستۆتەوە .. ئەمجار هەموویان رێك کەوتن کە تاقی بکەنەوە .. ئەمجار وشەیەکیان دانا لە خۆیانەوە کە لە شەش پیت پێك هاتبوو .. ئەمجار هاتن بۆ لای و سەری ئەویان ماچ کرد و زۆر بە مەزن تەماشایان دەکرد و گوتیان:- ئەی شەیخ .. مەسەلەیەك .. مەسەلەیەك .. لێمان تێك چووە و دەمانەوێت جەنابت بۆمانی روون بکەیتەوە .. گوتی:- دڵنیا بن کە هاتوون بۆ لای کەسێکی شارەزا .. پرسیارەکەتان چییە؟ ئێوە جیاواز دەبن و لە کاتێکدا من زیندووم؟؟!! گوتیان:- ئایە (الخنفشار) چییە؟؟ گوتی:- (الخنفشار) رووەکێکە لە باشوری یەمەن دەردەچێت .. تامەکەی هەندێ تاڵە .. وە ئەگەر وشتر بیخوات ئەوا شیرەکەی دەگیرێت .. وە خاوەن وشترەکان بە کاری دەهێنن کاتێ بیانەوێ وشترەکانیان بفرۆشن.. خەڵکی پێ دەخەڵەتێنن بۆ ئەوەی کریار وابزانێت کە ئەو وشترە شیری زۆرە کەچی ئەویش وا نییە .. ئەمجار شەیخەکە شانی دادا و گوتی:- وە (الخنفشار) لای عەرەب بە ناوبانگە .. وە لە

شیعرەکانیاندا باسیان کردووە وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەدا باسی کردووە .. ئەوەی شاعیرەکان باسیان کردووە شاعیرەکە کە وەسفی خۆشەویستەکەی دەکات و دەڵێت:-

لقد عقدت محبتكم فؤادي كما عقد الخليب الخنفشار

واتە:- خۆشەویستی ئێوە دڵی منی بەستووە .. هەروەکو چۆن الخنفشار شیری بەستووە .

ئەمجار مەندێ وەستا و گوتی:- ئەو بەڵگەیەی کە لە فەرموودەدا هاتووە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:- ....!!! هەموویان هاواریان کردو گوتیان:- بەسە ..بەسە .. لە خوا بترسە ئەی درۆزن .. درۆت کرد بە زمانی عەرەبەوە وە درۆت کرد بە زمانی شاعیرەوە وئێستا دەتەوێت، درۆ بکەیت بە زمانی پێغەمبەرەوە ﷺ.. ئەمجار لە نێو خۆیان دەریان کرد .. بۆیە دینەکەی خۆت مەخە بەر دەستی هەموو کەسێك کە بە ئارەزووی خۆیان ڕێگای پێ نیشان بدەن .. موفتی دەبێت دوو مەرجی سەرەکی تیادا بێت .. زانیاری و وەرع · یەکەمیان کە زانیارییە .. ئەویش بەڵگە هێنانەوەیە لە قورئان و فەرمودە ڕاست و دروستەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.. وە دووەمیان کە وەرعە دەبێت لە کاتی فەتوادا لە خوا بترسێت وە بە ماڵ و پلە و پایە هەڵنەخەڵەتێت .. بەڵکو دەبێت ڕاستی بڵێت و لەبەر خوا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسێت .. چەند کەمن لەم سەردەمەدا ئەو زانایانە کە تەنها بۆ خوا تێدەکۆشن ..

**دوا ئامۆژگاری ..**

راوەستانت لەبەر دەستی خوای پەروەردگاردا بهێنە یادی خۆت .. وە بزانە کە ئەم دونیایە ماڵێکی سەرەڕێیە نەك ماڵی مانەوە .. وە داوا لە خوا دەکەین کە ئاخر خەیرمان بکات ..

هاورێیەکم بۆی باس کردم ..گوتی:– لە کەنەدا بووم بۆ پزیشکی دەمخوێند .. وە هەرگیز ئەو رۆژەم لە یاد ناچێت کە بەسەر نەخۆشەکاندا دەسورامەوە وەکو هەموو رۆژێك لە ژووری چاودێری ورد (العنایه المرکزه) لە نەخۆشخانە .. وە ناوی نەخۆشێك سەرنجی راکێشام کە ناوی (محمد) بوو .. کە لەسەر جێگەی ژمارە (٢) بوو .. تەماشایەکی رویم کرد کە بە ئەستەم دەبینرا لەبەر زۆری ئەو هەموو ئامێرانە کە لە دەم و لوتی بوو .. ئەوە گەنجێکە لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدایە و توشی نەخۆشی ئایدز بووە لە پێش دوو رۆژ بە هۆی هەو کردنی سییەکانەوە هێناویانە بۆ نەخۆشخانە .. حاڵی ئەو زۆر زۆر ترسناکە .. لێی نزیك بوومەوە ویستم لەسەر خۆ قسەی لە گەڵدا بکەم .. محمد .. محمد .. ئەو دەنگی من دەبیسێ بەڵام بە چەند وشەیکی تێنەگەیەنراو قسە دەکات .. پەیوەندیم بە ماڵیانەوە کرد دایکی وەڵامی دامەوە .. لە قسەکانی وا دیارە کە لە بنەڕەتدا لوبنانییە .. لەوەوە زانیم کە باوکی بازرگانێکی گەورەیە و چەند دوکانێکی شیرەمەنی هەیە .. باسی حاڵی کوڕەکەم بۆ دایکی کرد .. وە قسەکان زۆر بوونەوە .. وە لە کاتی قسە کردندا ئاگاداری سەر ئامێرەکان بووم بە شێوەیەکی ترسناك زیادی کرد ئەویش ئەوە نیشان دەدات کە سوڕی خوێنی بە شێوەیەکی ترسناك دادەبزێت .. قسەکانم لەگەڵ دایکیدا تێك چوو .. هاوارم بە سەریدا کرد و گوتم:– دەبێت هەر ئێستا ئامادە بیت.. گوتی:– من ئێستا سەرقاڵی کارم لە پاش

دەوام ئامادە دەبم .. گوتم:- رەنگە ئەو کاتە کار لە کار ترازا بێت .. وە تەلەفونەکەم داخست .. لە پاش نیو سەعات یەکێ لە برین پێچەکان پێی ڕاگەیاندم کە دایکی ئەو کوڕە هاتووە .. وە دەیەوێت بمبینێت.. بینیم ئافرەتێکی تەمەن مامناوەندییە .. دیاردەکانی ئیسلامی بە سەرەوە دیار نییە .. کاتێ حاڵی کوڕەکەی بینی دەستی بە گریان کرد .. ویستم هێدی بکەمەوە .. خۆت پەیوەست بکە خوداوە و داوای لێ بکە کە خوای گەورە شیفای بدات .. بە سەرسوڕمانەوە گوتی:- تۆ موسڵمانیت؟ گوتم:- سوپاس بۆ خوا .. گوتی:- ئێمەیش موسڵمانین .. گوتم:- کەواتە .. بۆ لەسەر سەری ڕانەوستیت هەندێ قورئانی بۆ بخوێنیت .. بەڵکو ئازارەکەی کەم ببێتەوە.. دایکەکە شڵەژا .. ئەمجار دەستی بە گریانێکی زۆر کرد .. و گوتی:- هاە!! قورئان؟! نازانم!! هیچ شتێك لە قورئانم لەبەر نییە.. گوتم:- ئەی چۆن نوێژ دەکەیت؟ ئایە سورەتی فاتیحەت لەبەر نییە؟ دەنگی بچڕ بچڕ بوو وگوتی:- ئێمە نوێژ ناکەین تەنها لە کاتی جەژنەکاندا نەبێت لەو ڕۆژەوە کە هاتووین بۆ ئەم وڵاتە .. ئەمجار پرسیاری حاڵی کوڕەکەی کرد و گوتی:- ئەو حاڵی باش بوو تاکو هاتووچۆی ئەو کچەی نەکردبوو .. گوتم:- نەخێر ئەو دەیویست لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا حەج بکات! ئامێری ئاگادارکردنەوەکە زیادی کرد .. لەو کوڕە هەژارە نزیك بوومەوە .. ئەو خەریکە گیانی دەردەچێت .. ئامێرەکان بە شێوەیەکی ترسناك دەنگیان دێت .. دایکەکە بە دەنگێکی بیستراوەوە دەگیرێت ..برین پێچەکان بە سەرسامییەوە تەماشا دەکەن .. لە گوێی نزیك بوومەوە و گوتم:- بڵێ:

(لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) بڵێ ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)) کەچی هیچ وەڵام ناداتەوە .. بڵێ:

((لَا إِلَه إِلَّا اللَّهُ)) ئەو دەنگی من دەبیسێ ئەمجار هاتە سەر خۆی و تەماشای کردم.. ئەو هەژارە بە هەموو ئەندامەکانی هەوڵ دەدات .. فرمێسك بە چاوەکانیدا

دێتە خوارەوە .. ڕووی ڕەش هەڵگەڕا بوو .. بڵێ ((لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)) بڵێ ((لَـا إِلَـهَ إِلَّـا اللَّهُ)) ئەمجار بە دەنگێکی بچڕ بچڕەوە دەستی بە قسە کردن کرد:- ئاه .. ئـاه .. ئازارێکی سەختە .. کـەمێك ئـارام بەخـشم دەوێت بـۆ ئازارەکـانم .. ئـاه.. ئـاه .. ئەمجار منیش دەستم کرد بە تکا کـردن و گـوتم بڵـێ ((لَـا إِلَـهَ إِلَّـا اللَّـهُ)) لێوەکـانی دەسـتی بـە جوڵـە کـرد .. خۆشـحاڵ بـووم .. ئـەی خودایـە ئـەو ئێستا شـایەتمان دەهـێنێ .. ئێـستا دەیڵێـت .. بـەڵام گـوێی:- ( I cant I cant ) کـوا کـچە هاوڕێکەم .. کچە هاوڕێکەم دەوێت .. ناتوانم .. ناتوانم .. دایکەکە تەماشا دەکـات و دەگـری.. لێدانی دڵـی کـەم بـووەوە .. بـڵاو بـووە وە .. خـۆم پـێ ڕانـەگیرا .. منیش بە کوڵ دەستم بە گریان کرد .. دەستەکانیم گرت دیسان هـەوڵم لـە گەڵیـدا دا .. تکات لێ دەکەم .. بڵێ ((لَـا إِلَـهَ إِلَّـا اللَّـهُ)) نـاتوانم .. نـاتوانم .. لێدانی دڵـی وەستا .. ڕەنگـی ڕەش داگـەڕا .. ئـەمجار مـرد .. دایکەکـە ڕووخـا .. وە خـۆی دا بەسەر سنگیدا و هاوار دەکـات .. کـاتێ ئـەم دیمەنـەم بـینی خـۆم پـێ ڕانـەگیرا .. هـەموو عادەتـە پزیـشکییەکانم لـە بـیر چـوو .. هـاوارم بەسـەر دایکەکـەدا کـرد و گوتم:- تۆ بەر پرسیاریت .. تـۆ و بـاوکی .. ئەمانەتەکـەتان بـزر کـرد خـوا بزرتـان بکات .. ئەمانەتەکەتان بزر کرد خوا بزرتان بکات ..

﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُـوا الـصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ [الجاثية: ٢١].

واتە:- ئایە ئەوانەی کە گوناهو تاوانەکانیان ئەنجامداوە، وایـان زانیـووە هـەروەك ئەوانـە حـسابیان بـۆ دەکـەین کـە ئیمانیـان هێنـاوە و کـار و کـردەوە چاکەکانیان ئەنجامـداوە؟! ژیـانی دنیـاو مـردن و دوای مردنیـان وەك یـەك دەبێـت؟! ئـای کـە بڕیاری خراپ بڕیار دەدەن.

## لە کۆتاییدا ..

گەورەترین شتێك کە ڕێگر بێت بەرامبەر بە بەندە بۆ چوونە ناو بەهەشتەوە هاوەڵ دانانە بۆ خوا .. ئەوەیش گەورەترین ئەو حەرامانەیە کە خوای گەورە دیاری کردووە .. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:–

(ألا أنبئكم بأكبر الكبائر ثلاثا؟ الإشراك بالله)[٢٨] .

واتە: ئایە گەورەترین تاوانەکانتان پێ بلێم؟) سێ جار فەرمووی .. گوتیان:– بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ.. ئەویش فەرمووی:– هاوەڵ دانانە بۆ خوای گەورە.

وە هەموو تاوانێك دەکرێ خوای گەورە لێی خۆش دەبێت تەنها هاوەڵ دانان نەبێت . هاوەڵ دانان تەوبەیەکی تایبەتی دەوێت .. خوای گەورە دەفەرموێت:–

﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيداً﴾ [النساء: ١١٦] .

واتە:– بە ڕاستی خوای گەورە خۆش نابێت لەوە هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار بدرێت و جگە لەو هاوبەش دانانە لە گوناهانی تر بۆ هەر کەس بیەوێت و شایستە بێت وپەشیمان بێت خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بە ڕاستی گومڕا بووە بە گومڕاییەکی زۆر دوور .

وە لە دیاردەی ئەو هاوەڵ دانانە کە لە زۆربەی وڵاتانی موسڵماناندا بڵاو بووەتەوە .. پەرستنی گۆڕەکانە .. وە باوەڕ بوون بەوەی کە خۆشەویستانی خوا (ئەوانەی کە مردوون) دەتوانن کارەکان جێ بەجێ بکەن وکێشەکان لەسەر

(٢٨) (متفق عليه، وانظر: صحيح الترغيب والترهيب: ٢٢٩٩).

خەڵکی لادەن . وە پەنا گرتن و هاوار کردن بەوان .. لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ﴾ [الإسراء: ٢٣] .

واتە:– پەروەردگاری تۆ بڕیاری داوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن .

وە هەروەها داوا کردن نە مردووان لە پێغەمبەران(سەڵات وسەلامی خوایان لەسەر بێت) وپیاو چاکان و غەیری ئەوان بە مەبەستی ئەوەی کە لە تەنگانەکان ڕزگاریان بکەن .. وە خوای گەورە دەفەرموێت:–

﴿أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاء الْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ قَلِيلاً مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ [النمل: ٦٢] .

واتە:– ئایا کێیە جگە لە زاتی پەروەردگار کە بێت بە هانا وهاواری لێقەوماو و بێ دەرتان و بێ دالدەوە، کاتێک نزا دەکات و لێی دەپاڕێتەوە ئەوسا بەڵاو ناخۆشیەکان لادەبات و دەتانکاتە نیشتەجێ و جێنشین لە زەویدا، ئایا ڕەوایە لەگەڵ ئەو زاتە خوای تر هەبێت؟! کەمێك یادەوەری وەربگرن و تێفکرن و بیربکەنەوە.

وە هەندێکیان هەردەم پەنا دەگرن بە ناوی شەیخێکەوە یان خۆشەویستێك لە خۆشەویستانی خواوە .. ئەگەر هەستا یان دانیشت .. وە هەر کاتێك ئەگەر یەکێکیان توشی کێشەیەك یان بەڵایەك بوو ئەوا هاوار دەکات ودەڵێت:– یا محمد.. وە ئەویتر دەڵێت:– یا علی .. یا حسین .. یا بدوی .. یا گەیلانی .. یا شاذلي .. یا رفاعی .. وە ئەوتریان داوا لە (العیدروس) دەکات .. وە ئەویتریان داوا لە سیدە زینب دەکات .. یان ابن علوان .. لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت:–

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ فَادْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ [الأعراف: ١٩٤] .

واتە:- بەڕاستی ئەوانەی ئێوە هاواریان لێ دەكەن جگە لە خواو لێیان دەپاڕێنەوە، چەند بەندەیەكی وەك ئێوەن (هیچیان بەدەست نییە) دە هاواریان لێ بكەن، بابێن بە دەمتانەوە، ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن لەو داوایەتاندا.

وە هەندێ لە گۆڕ پەرستان بە دەوری گۆڕەكاندا دەسوڕێنەوە .. وە دەست لە كۆڵەكەكانی دەدەن .. یان بە دەستیان دەیسڕن .. و ماچی دەكەن و سوژدەی بۆ دەبەن .. وە لەبەر دەستیدا بە خشوع وترسەوە ڕادەوەستن و داوای ئەنجامدانی كارەكانیان لێ دەكەن وداوای شیفای نەخۆشەكان دەكەن و یان داوای ئەوەی لێ دەكەن كە كوڕیان ببێت .. یان كارەكانیان بۆ ئاسان بكات .. وە ڕەنگە هەندێ لەوانەی كە سەردانی گۆڕەكان دەكەن .. بڵێت:- ئەی گەورەم .. من لە وڵاتێكی دوورەوە هاتووم بۆ لای تۆ تكایە پەشیمانم مەكەرەوە .. وە خوای گەورە دەفەرموێت:-

﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ﴾ [الأحقاف: ٥] .

واتە:- كێ لەو كەسە گومڕاترە كە دوعا و نزا و پاڕانەوە ڕوو بە كەسێك یان شتێك دەكات، جگە لە خوا، كە ئەگەر هەتا ڕۆژی قیامەتیش لێی بپاڕێتەوە بێ سوودە، نە بە هانایەوە دەچێت، نە بە پەرستنەكەش دەزانێت، لە كاتێكدا ئەوانە لە دوعا و پاڕانەوەی ئەوان بێ ئاگا و غافڵن و هەستی پێ ناكەن .

وە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت ﷺ:-

(هەركەسێ بمرێت و هاوەڵی بۆ خوا دانابێت ئەوا دەچێتە ئاگرەوە)[٢٩] .

وە هەندێكیان لە نزیكی گۆڕەكان سەریان تەراش دەكەن .. وە هەندێكیان كتێبێك دەنوسێت كە هانی خەڵكی دەدات بۆ ئەو هاوەڵ دانانە وەكو:-

( مناسك حج المشاهد) (واتە: دروشمەكانی حەجی مەزارگەكان) كە مەبەستی لە (المشاهد) گۆڕ و قەبری پیاو چاكانە ..وە هەندێكیان باوەڕیان وایە كە هەندێ لە خۆشەویستانی خوا دەستێكی باڵایان هەیە لە بەڕێوەبردنی گەردووندا .. وە ئەوان زیان و قازانجیان هەیە .. وە خوای گەورە دەفەرموێت: -

﴿وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدُيرٌ ﴾ [الأنعام: ١٧ ].

واتە:- دڵنیابە لەوەی ئەگەر خوای گەورە دووچاری زیان و گرفتێكت بكات، ئەوە هەرگیز لابەری نییە جگە خۆی نەبێت، خۆ ئەگەر بیەوێت تووشی خێر و خۆشیەكت بكات، ئەوە ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە .

وە دروست نییە نوێژ لە مزگەوتێكدا بكرێت كە لە حەوشەكەیدا یان لە ڕووەو قیبلەكەی گۆڕ هەبێت لەبەر فەرموودەیەكی پێغەمبەری خواﷺ كە دەفەرموێت:- (لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد)[٣٠]. واتە: خوای گەورە نەفرەتی كردووە لە جولەكەو گاورەكان چونكە لەسەر گۆڕی پێغەمبەرانی خۆیان مزگەوتیان دروست كرد .

وە دەفەرموێت:- (ألا وإن من كان قبلكم كانوا يتخذون قبور أنبيائهم وصالحيهم مساجد ألا فلا تتخذوا القبور مساجد إني أنهاكم عن ذلك)[٣١] . واتە: ئەوانەی لە

---

(٢٩) (رواه البخاري).

(٣٠) (متفق عليه، وانظر: صحيح الجامع الصغير: ٥١٠٨).

(٣١) (رواه مسلم، وانظر: صحيح الجامع الصغير: ٢٤٤٥، ٢٧٤٥).

پـێش ئێـوە بـوون لەسـەر گـۆڕی پێغەمبـەران و پیاوچـاکانی خۆیـان مزگـەوتیان دروست دەکرد، بۆیە ئێوە گۆڕەکان مەکەنە مزگەوت و من قەدەغەتان لێ دەکەم·

وە لـە دیاردەکـانی هـاوەڵ دانـان:- سـەربڕین بـۆ غـەیری خـوا، خـوای گـەورە دەفەرموێت:-

﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ [الكوثر: ٢] ·

واتە:- کەواتە نوێژ تەنها لەبەر خواو بۆ بە دەستهێنانی ڕەزامەنـدی پـەروەرگارت ئەنجام بدە و قوربانییش بکە هـەر بـەو شێوەیە بۆ بـە دەستهێنانی ڕەزامەنـدی پەروەردگارت ·

وە خۆشەویست ﷺدەفەرموێت:- (لعن الله من ذبح لغير الله)[٣٢] ·

واتە: خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو کەسەی کە بۆ غەیری خوا سەردەبڕێت·

وە ڕەنگە لەسەربڕاوێکدا دوو حەرام کۆ ببێتـەوە .. کـە ئـەوانیش:- سـەربڕینە بـۆ غەیری خوا .. وەکو ئەوەی کەسێك شتێك سەردەبڕێت بۆ ئـەوەی لـە غـەیری خـوا نزیـك ببێتـەوە .. ( وەکـو ئـەوەی کـە لـە خـاوەن گۆڕەکـە نزیـك ببێتـەوە یـان بـۆ جنییـەك سـەردەبڕێت کـە لـە خراپـەی جنییەکـە خـۆی بپارێزێـت .. هتـد ) وە دووەم:- سەربڕینێك کە ناوی جگە لە خوای لەسەر بهێنێت:- وەکو کەسێك نـاوی کەسـێکی تـر (جگـە لـە خـوا) لـە کـاتی سـەربڕینەکە بهێنێـت .. ( وەکـو نـاوی خۆشەویستێك لە خۆشەویستانی خوا یان شەیخێك) وە ئـەو دووانـە دەبنـە هـۆ بـۆ حەرام بوونی خواردنەکە .. وە هەروەها لە جۆرەکانی هـاوەڵ دانـان بـۆ خـوا نـەزر کردنـە بـۆ غـەیری خـوا .. وەکـو ئەوانـەی کـە نـەزر دەکـەن و مـۆم و ڕونـاکی دادەگیرسێنن و صەدەقە دەکەن بۆ خاوەن گۆڕەکان .. وە لە جۆرێکی تـر هـاوەڵ

---

(٣٢) (رواه مسلم، وانظر: صحيح الجامع الصغير: ٥١١٢)·

دانان کە ئەمڕۆ بڵاوەی کردووە:- جادوو و فاڵە .. جادوو یەکێکە لە تاوانە گەورەکان .. وە خاوەنەکەی بەرەو کوفر دەبات (خوا پەنامان بدات) وە ئەویش زیانی هەیە و قازانجی نییە .. خوای گەورە دەربارەی فێربوونی دەفەرموێت:-

﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَـكِنَّ الشَّيْاطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ﴾ [البقرة: ١٠٢] .

واتە:- ئاشكرایە كە هەرگیز سولەیمانﷺ كافر نەبووە، بەڵكو شەیتانەكان كافربوون بەهۆی ئەوەی كە خەڵكیان فێری سیحرو جادوو دەكرد .

وە ئەو كەسەی كە سیحر بەكار دەهێنی بە كۆڕای زانایان كافرە، خوای گەورە دەفەرموێت:-

﴿إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى﴾ [طه: ٦٩] .

واتە:- چونكە بێگومان ئەوەی كردوویانە تەنها فێڵ و تەڵەكەی جادووگەرە، جادووگەریش بۆ هەر كوێ بچێت و هەرچی بكات سەركەوتوو نابێت .

وە هەروەها كاهن و فاڵچی ئەوانە هەردوكیان كافرن بە خوای مەزن ئەگەر گوتیان ئێمە غەیب دەزانین، خوای گەورە دەفەرموێت:-

﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ﴾ [النمل: ٦٥] .

واتە:- ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: جگە لە خوا هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە هیچیان ئاگادارنین لە پەنهان و غەیب نازانن .

وە زۆربەی ئەوانە سادەیی هەندێ خەڵكیان قۆستۆتەوە بۆ كۆ كردنەوەی پارە .. وە ڕێگا دەدۆزنەوە بۆ ئاشكراكردنی غەیب وەكو ( هێڵكاری لم) و (ناو لەپ خوێندنەوە) و (فنجان) و .. هتد . وە ئەگەر جارێك ڕاست بكەن ئەوا سەد جار درۆ دەكەن، بەڵام گێلەكان تەنها ئەو جارەیان لە بیرە كە ئەو خراپەكارانە ڕاستیان كردووە .. بۆیە دەچن بۆ لایان بۆ زانینی داهاتوو و خۆشگوزەرانی و ناڕەحەتی لە

ژن هێنانەکەیاندا یان بازرگانییەکەی و گەڕان بۆ شتە بزر بووەکان و شتی تر ..
وە حوکمی ئەو کەسەی کە دەچێت بۆ لایان ئەوەیە ..

١- ئەگەر باوەڕی بە قسەکانی هەبوو ئەوا کافرە لەبەر فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێت:-

(من أتى عرافا أو كاهنا فصدقه بما يقول فقد كفر بما أنزل على محمد ﷺ)[٣٣] .

واتە: هەر کەسێ بڕوات بۆ لای کاهینێك یان فاڵچییەك و باوەڕی بە قسەکانی کرد ئەوا کوفری کردووە بەو قورئانەی کە دابەزیوەتە سەر محمد ﷺ.

٢- ئەگەر ئەو کەسەی کە دەچێت بۆ لایان باوەڕیان پێ نەکات و باوەڕیان بەوە نەبێت کە ئەوانە غەیب دەزانن بەڵام بۆ ئەوە دەڕوات تەنها بۆ تاقیکردنەوە و شتی وا . ئەوە کافر نابێت بەڵام تاوانێك لە تاوانە گەورەکانی ئەنجام داوە وبۆ ماوەی چل ڕۆژ نوێژەکەی لێ وەرناگیرێت .. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

(من أتى عرافا فسأله عن شيء لم تقبل له صلاة أربعين ليلة)[٣٤] .

واتە: هەر کەسێ بڕوات بۆ لای فاڵچییەك و پرسیاری لێ بکات ئەوا بۆ ماوەی چل شەو نوێژەکەی لێ وەرناگیرێت.

ئەمە لەگەڵ ئەوەی نوێژەکانی و تەوبەی لەسەر فەرزە.. وە لەگەڵ ئەوەیشدا پەنا بردنە بۆ بورجەکانی بەخت لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا .. ئەگەر باوەڕی هەبوو کە ئەستێرە و فەلەك کاریگەرییان هەیە لە گەردووندا ئەوا هاوەڵی بۆ خوا داناوە .. وە ئەگەر تەنها بۆ کات بەسەر بردن خوێندییەوە ئەوا تاوانبارە .. چونکە نابێت کات بەسەر ببات بە خوێندنەوەی (شیرك) وە لەگەڵ ئەوەیشدا شەیتان بەرەو

---

(٣٣) (رواه أحمد، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح الجامع الصغير: ٥٩٣٩).

(٣٤) (صحيح الجامع الصغير: ٥٩٤٠).

باوەڕ بوون پێی دەیبات ودەبێتە ڕێگایەك بەرەو هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە، وە لەو جۆرە هاوەڵ دانانە بچووکە کە دەبێتە هاوەڵ دانانی گەورە .. بە کار هێنانی نوشتەو میروو ئەڵقەی کانزایی .. وە دەکرێتە گەردنی منداڵی و غەیری ئەوان بۆ دوور کەوتنەوە لە چاوپیسی .. یان دەیبەستنە جەستەی خۆیانەوە .. یان بە ماڵ و ئۆتۆمبیلەکەیاندا هەڵی دەواسن .. یا خود چەند ئەنگوستیلەیەك دەکەنە دەستیان بە مەبەستی ئەوەی بەلا لەسەریان نەمێنی یان بەربەرچی بداتەوە .. وە هەموو ئەوانەی کە باسمان کرد حەرامە .. لەبەر فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێت:-

(من علق تميمة فقد أشرك)[٣٥] .

واتە: هەر کەسێ تەمیمەیەکی(میروو یاخود ناڵی گوێ درێژ یاخود هەر شتێکی تر بۆ خۆ پاراستن لە چاو) هەڵواسی ئەوا هاوبەشی بۆ خوای گەورە داناوە.

وە ئەو کەسانەی کە ئەوانە ئەنجام دەدەن، ئەگەر باوەڕیان وابێت کە ئەو شتانە سوودیان هەیە یان زیانیان هەیە جگە لە خوا ئەوا هاوبەش بڕیاردانێکی گەورەی ئەنجام داوە .. وە ئەگەر باوەڕی وابێت ئەوانە هۆیەکن بۆ سوود و زیان ئەوا هاوبەش بڕیاردانێکی بچووکی ئەنجام داوە .. چونکە خوای گەورە نەیکردووەتە هۆیەك .. وە هەروەها سوێند خواردن بە غەیری خوا .. نابێت هیچ دروستکراوێك سوێند بە غەیری خوا بخوات .. چونکە سوێند خواردن تەنها شایەنی خوای گەورەیە .. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:- (من حلف بغير الله فقد أشرك)[٣٦] .

---

(٣٥) (صحيح الجامع الصغير: ٦٣٩٤).

(٣٦) (صحيح الجامع الصغير: ٦٢٠٤).

واتە: هەر کەسێ سوێند بە غەیری خوا بخوات ئەوا شەریکی بۆ خوای گەورە ئەنجام داوە.

وە هەروەها سوێند خواردن بە کەعبە نابێت .. یان بە ئەمانەت .. یان بە شەرەف.. وە یان بە ژیانی فلان یان لەبەر خاتری پێغەمبەر ﷺ یان لەبەر خاتری خۆشەویستێك لە خۆشەویستانی خوا یان بە دایکان .. هەموو ئەوانە حەرامن .. وە هەرکەسێ توشی یەکێك لەوانە بوو ئەوا کەفارەتەکەی ئەوەیە کە بڵێت:- ﴿لا اله الا الله﴾ هەروەکو چۆن لە فەرموودەیەکی راست و دروستدا هاتووە:- (من حلف منكم فقال في حلفه واللات والعزى فليقل لا إله إلا الله)[٣٧] .

واتە: هەر کەسێ لە ئێوە سوێندی خوارد و لە سوێندەکەیدا گوتی:- سوێند بە لات و عوزا .. ئەوا کەفارەتەکەی ئەوەیە کە بڵێت .. لا اله الا الله.

وە لەو شتانەی کە مرۆڤ بەرەو شیرك دەبات .. وتەی حەرامە .. وەکو ئەوەی کەسێك بڵێ:- پەنا دەگرم بە خوا و تۆ .. یان .. ئەمە لە خوا و لە تۆوەیە .. یان.. کەسم نییە لە خوا و تۆ زیاتر .. وە راستییەکەی دەبێت وشەی (پاشان) بەکار بهێنێ وەکو ئەوەی بڵێت:- پەنام هێناوە بۆ خوا پاشان بۆ تۆ .. وە هەروەها لەو وشەکانی تردا ..وە هەروەها هەموو رستەیەك کە جوێندانی تیادا بێت بە رۆژگار .. وەکو .. ئەمە زەمانێکی خراپە .. یان .. ئەم کاتە کاتێکی بەد بەختییە.. یان .. زەمانە ستەمکارە .. وە لەو جۆرە .. چونکە جوێن دان بە رۆژگار دەگەڕێتەوە بۆ خوای رۆژگار .. کە ئەویش خوای پەروەردگارە .. وە هەروەها دەبێت پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان خۆیان بپارێزن لە بە دیهێنانی شتی تازە لە دیندا .. وە لەو جۆرە ئاهەنگێڕانی دروستکراوە لە دیندا وەکو ئاهەنگی

(٣٧) (صحيح الجامع الصغير: ٦٢١٦).

یادی لە دایك بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ یان ئاهەنگ گێڕان بۆ شەوی ٢٧ ی رەمەزان ... یان ئاهەنگ گێڕان بۆ شەوی ئیسرا و میعراج .. وە جگە لەوانە چەندەها ئاهەنگی تر .. داوا لە خوا دەکەم کە بتپارێزیت و یارمەتیت بدات .. وە بیروباوەڕت پاك بکاتەوە لە هەموو جۆرە شیرکێك .. آمين ..

لە کۆتاییدا:- ئەی برای خۆشەویست .. ئەی خوشکی رێزدار .. ئەم کۆمەڵە ئامۆژگارییە لە ناخەوە دەرم هێناوە .. کە روحی خۆمم بە سەریدا رژاندووە .. وە هەموو قسەیەکم بە راستەوە بۆت کردووە .. دەبا بەشی من لە لای تۆوە لە نزایەك کەمتر نەبێت .. کە رەحم و بەزەیی خوا دابەزێتە سەرماندا وە تەنها خۆی (أرحـــم الراحمين) ە .. والله تعالى أعلم .. وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آلـــه وصـــحبه أجمعين.